پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامیی
(٣)

# مرۆڤ لە نێوان دوو شەریعەتدا

## ڕوانینێکی قورئانییانە بۆ خۆناسین و ناسینی ئەویتر

نووسینی:
عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان

وەرگێڕانی:
د. صەباح موحەممەد بەرزنجی

# الانسان بين شريعتين

## رؤية قرآنية في معرفة الذات ومعرفة الآخر

عبد الحميد أحمد أبو سليمان
ترجمة:
د. صباح محمد البرزنجي

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(٣)

# مرۆڤ لە نێوان دوو شەریعەتدا

## ڕوانینێکی قورئانییانە، بۆ خۆناسین و ناسینی ئەویتر

نووسینی:

د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان

وەرگێڕانی:

د. صەباح موحەممەد بەرزنجی

چاپی یەکەم

٢٠٠٧ زاینی ٢٧٠٧ کوردی ١٤٢٨ کۆچی

# مرۆڤ لە نێوان دوو شەریعەتدا

## ڕوانینێکی قورئانییانە، بۆ خۆناسین و ناسینی ئەویتر


* نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان.

* وەرگێڕانی: د. صەباح موحەممەد بەرزنجی.

* لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (٣).

* ژمارەی سپاردن: (١١٠١)ی ساڵی ٢٠٠٧ی وەزارەتی ڕۆشنبیری.

* چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٧.

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

* چاپخانە: کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر.

* ئیمەیلی پرۆژە: iiitkurdistan@yahoo.com



* مافی لەچاپدانی ئەم بەرهەمە پارێزراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# سەرەتا

بەردی بناغەی نەتەوەکەمان لە سەر ڕاستە ڕێ، بریتییە لە بەرچاو ڕوونی. قورئانی پیرۆز بۆ خۆی تەنها سەرچاوەیە بۆ وەرگرتنی ئەم تێگەیشتنە ڕوونە:نەتەوەکەشمان مەحاڵە لە سروشتی خۆی و جەوهەری ئامانجەکەی حالیی ببێ ئەگەر ئەم تێگەیشتنە روونەی نەبێ.

بە بێ خۆ ناسین و بەرچاو روونی نەتەوەش نابزوێ ووزەکانی ڕەهانابن و دووبارە نابووژێتەوە.

کەواتە تێگەیشتنی ڕوون و شارەزایی لە خاڵەکانی دەستپێکردن، کارێکی بنەڕەتین بۆ خۆناسین وناسینی ئەویتریش، لە ئەنجامدا بۆ دیاریکردنیبنەماکانی مامەڵەی کاریگەر لە گەڵیدا.

نەتەوەکەمان بە دەس نەبوونی تێگەیشتن و خۆناسینەوە زۆر ناڵاندوویەتی بە شێوەیەك هەتاکوو ئێستاش گرفتاری تەم و مژو پەلهاویشتنی کوێر کوێرانەو چاولێگەری بووە و لە ئاکامدا وزەکانی لاوازو بڕیارەکانی سست بوون.

دوای ئەوەی لە ڕوانگەی کۆسمۆلۆجیای قورئانییەوە سەرنجی ئاسۆکانی بوونەوەرم دا، بۆم دەرکەوت کە بوون و مرۆڤ و پەیوەندی نێوانیان لەلایەك و هەڵوێستی ئیسلام ونەتەوەش لەلایەکی ترەوە، ئەوەندە ئاشکراو شکۆمەندن کە زووتر بە خەیاڵدا نەدەهات، بە هەمان ئەندازەش ئەم تێڕوانینە قورئانییە

مرۆڤـی خۆرئـاوای پـێ ناسـاندم سروشـت و دەسـتپێکەکانی و هـەروەها خـاڵی هاوبـەش لـە گەڵیـدا و خاڵـە جیاوازەکـان تـاوەکوو کلیلـی زۆر لـەو چـەمکانەم دەسـتکەوت کـە زووتـر لـێم داخرابـوون و نەمـدەزانی چـۆن مامەڵـەیان لەگـەڵ بکەن.

بۆیــە خــۆم پێنــەگیراو خامــەم گــرت بەدەســتەوە بــۆ تۆمــارکردنی ئــەم سەرنجانەو خستنەڕوویان بۆ خوێنەری هێژاو بیرمەندانی نەتەوەکەم.بۆ ئـەوەی پتر لە تێگەیشتنی کۆسمۆلۆجیای قورئانی قووڵ ببینـەوە لـەم بـوارە گـرنگ و سـتراتیژییەدا، هـەروەها بۆئـەوەی جـارێکی تـر نەتـەوە بێتەسـەر شـەقام و ڕۆشنبیری ئیسلامی، پاڵفتە بکرێ و وزە ژیاریی و ڕیفۆرمییەکان بکەونە تـەکان و ڕووبەڕووی کێشەکانی سەردەم ببێتەوە وڕەوتی مرۆڤایەتی بەرەو ئاراسـتەی ڕاستی و دادگەری و ئاشتی، بەو پەڕی هێزو تواناوە ڕاست بکاتەوە.

بێگومــان تــا بیروبــڕوا ڕوون و ئاشــکرا نــەبێ، وە تــا خۆمــان نەناســین و فەرهەنگەکـەمان پاڵفتەنەکـەین و لـە چـاولێکەری کوێرانـە دەربـاز نـەبین و تـا ڕۆڵەکانمان لە نەخۆشیە دەروونییەکانی لادان ودواکـەوتن چارەسـەر نەکـەین و تا بەباشی لە مرۆڤی خۆرئاوایی و شێوەکانی مامەڵە کردنی کاریگەرانـە لەگـەڵ ئـەو حـاڵیی نەبین،ئـەوا قـەت نـاتوانین هەسـتین بـە تـازە گـەریی و ڕیفـۆرم و ناتوانین پلەو پایەی نەتەوەکەشمان لە سەر سەکۆی رابەرایەتی ژیار بەدەسـت بهێنینەوە،واتـە ناشـتوانین ئـەم ژیـارە ڕاسـت بکەینـەوە و ڕەوتـی ڕەوای پـێ بدەین.

هیـوادارم ئـەم کتێبـە و ئـەم هـەنگاوە بـۆ خـستنە گـۆی قورئـانی پـیرۆزو کۆسمۆلۆجیـای قورئـانی، سـەرنجی بیرمەنـدان ڕابکێـشێت و بیخەنـە دووتـوێی

هەوڵ و تەقالا هزری و ڕیفۆرمخوازەکانیانەوە، بەڵکونەتەوەکەمان لەش ساغی خۆی دەست بکەوێتەوە و ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە.

پەیامەکەی بگەیەنێت و ئەرکەکەی هەڵبگرێت.

لە پێناوی مرۆڤ و ژیاردا...

هەر خوای گەورەش پشت و پەنای هەموانە.

**پ. د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان**

**٢٧ / ٧ / ١٤٢٣ ك**

**٥ / ٩ / ٢٠٠٢ ز**

# مرۆڤ لە نێوان دوو شەریعەتدا

# ڕوانینێکی قورئانییانە بۆ خۆناسین و ناسینی ئەویتر

## پێشەکی: فەلسەفەی پێگەیشتوو بڕوایەکی پتەوە

مرۆڤ بە هۆش و ئاوەزەوە لە دایك دەبێ، خـوای گـەورە لـە دروسـتکراوانی دیکە بەمە جیای کردووەتەوە، وەك ئەوەی قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ دەکات کاتێـك دەفـەرموێ: (وَعَلَّـمَ آدَمَ الأَسْـمَاء كُلَّهَـا ثُـمَّ عَرَضَـهُمْ عَلَـى الْمَلاَئِكَـةِ فَقَـالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ)( البقرة: ٣١).

بە بـڕوای مـن مەبەسـت ئـەوە نیـە کـە ئـادەمی فێـری ڕاسـتە واتـای نـاوی شـتەکان کردبێـت، چـونکە پێکهاتــەو توانــای مــرۆڤ (بــەو پییــەی کــە خــوا دروستیکردوە) ئەمە ناگەیەنێت " ئەگەر وابێـت کەواتـە هـەموو ئـەو شتانەشـی فێری ئادەم کردووە کە لە دۆخە ژیارییە بەراییەکـە[1] دا نەیـدیبوون، (ئەوانـەش کەدواتر ڕوویانداوە یان ڕوودەدەن) تـا ئـەو سـاتەی قیامـەت هەڵدەسـتێت، بـە هەموو زمانەکان. ڕوودانی شتێکی لەو جۆرە لە مێـژووی مرۆڤـدا هـیچ نیـشانەو بەڵگەیەکی ئاشکرای لەسەر نییە، بە پێی ئەو زانیارییانـەی لەسـەر سروشـت و توانستی مرۆڤ لە بەردەستدان.

---

[1] جۆری بڕوای باوە ئادەم و پەیوەندیی ئەو بە خوداوە بابـەتێکی ویژدانییـەو هـیچ رەبتێکـی بـە پرسـە ژیـاری یـە رۆشنبیرییە ئاوەدانییە مادییەکەوە نیە، بۆ نموونە دەشتەکییەکی سادە لە بیابان دەشێت بڕوایەکی باشتر و دەروون و ویژدانێکێکی پاکتری لە زۆر زانای بەرجەستەی لە خۆبایی هەبێت، چ جای ئەوانـەی بـێبڕوان لـە پێـشکەوتووترین پایتەختی ژیاری ئاوەدانی ئەم جیهانەدا.

دەشـزانین کـە راسـتەواتای هـەر ناوێـك، مانـا و بایـەخی نابێـت ئەگـەر هۆشـیارییەك نـەبێت لەسـەر مانـاو چـەمکەکەی، واتـە ئەگـەر زانیـاری لەسـەر سروشت و ناخ و ئەرکی ئەو شتە، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان بـوونی نـەبێت، کەواتەمانای شیاو ئەوەیە کە مرۆڤ توانای دەرککردنی هەبێت، واتـە ئـەو شـتە هاوبەشانە کە تاکەکان کۆ دەکەنـەوە، دابماڵێـت و بیانگێڕێتـەوە بـۆ بنەچـە و ڕەگەزەکانیان، کەئەمە لە ئەفراندنی ئادەمدا، کاتێك ڕێك وپێك و گیانی بەبەردا کرا، ڕوون وئاشکرایە.

بۆ نموونە کورسیەکان، یان خانووەکان، یان گیانلەبەران، لە فۆرم و ڕەنـگ و پێکهاتــەو دیمەنــدا جیــاوازن، بــەڵام هــەر هەمووشــیان لەیــەك دەچــن و دەگەڕێنەوە بۆ چەند ڕەهەندێك کە دەیانخاتە پـاڵی یـەك لـە جـۆر و چەشـندا. ئـەوەتا کورسـی نوسـینگە، کورسـی پێـشوازیی، کورسـی ئۆتۆمبیل،کورسـی گەورە، بـچووك، کورسـی تەختـە، ئاسـن و پلاسـتیك هـەموویان هـەن و بـەڵکو جۆرەها کورسی هەن لە شێوە و ڕەنگ و قەبارەی جیاواز دا، هەر هەمووشـیان لەوەدا کۆ دەبنەوە کە بەکاردێن بۆ دانیشتن و پشوودان.

کەواتە مرۆڤ کە توانای دەرك و جیاکرنەوە و داماڵینی هـەبوو، واتـە توانـای زانـست و زانیاریـشی هەیـە ودەتـوانێ هـزرو داهێنـانیش هـەبێت و لـە زمانـە جیاوازەکاندا هێمای ناوەکان بەرهەم بهێنێت.

بـە بـڕوای مـن توانـای دەرك کـردن و توانـای زمانـەوانی بـۆ هێماکـان واتـە ناوەکانیان و بـەکارهێنانیان لـە سـەر شـتەکان بووەتـە توانـای مـرۆڤ لـە ڕووی ژیاری و ئاوەدانییەوە — واتە ئەگەر مرۆڤ توانای دانانی هێماو بەکارهێنانی نەبا نەیدەتوانی بنووسێت و نەشـیدەتوانی زانـست و زانیارییـەکان پـەرەپێبـدا و لـە سەر زەویش داوای جێ نشینایەتی لێ نەدەکرا.

کەواتە ئەمەیە مەبەستی (فێرکردنیناوەکان) کـە قورئـانی پـیرۆز ئامـاژەی پێدەکات و خوای پەروەردگار مرۆڤی پێ جیاکردوەتەوە.

لــە پێداویــستییەکانی عــەقڵ و ئــاوەزی جیاکــەرەوەی مرۆڤــە، بــوونی توانستەکانی بیرکردنــەوە و تێڕامــان و بـاس و ووردبوونــەوە و بەرهــەمهێنانی هزرو نەخشەکێشان بۆ جوانییەکانی بیناسازی و دەست ڕەنگینـی لـە ژیانـدا و دۆزینــەوەی ڕێنمـا بـۆ ڕێگاکـانی ژیـان، بـۆ ئــەوەی یارمەتیـدەری بێـت لــە تێگەیشتنی چەمکی ژیان و چوونە ژێر باری ئەرکەکانی.

بۆیە دەبوو عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ بە پێی ئەو تێگەیـشتن و بیرکردنەوەیـەی کە هەیەتی، پرسیاری لە سروشت و لە بوون و لە جیهـان و لـە ئامـانجی خـۆی کردبا، و بیپرسیبا کە سەرچاوەی ئەم بوون و جیهانە چیە؟ و چ چارەنووسـێك وا لە ڕێگای ئەم و جیهانەکەیدا؟ ئەم لایەنە بەردی بناغەی ڕەهەندی مەعنەویی مرۆڤە و سەرچاوەی ئاینیشە، کە پێکهێنەر ڕەهەندێکی بنەڕەتیە لە ژیان و لـە ڕوانینەکانی، لە وێشەوە ئەم پرسیار لە خۆکردنە و ئەم باسە ئاینی و فەلـسەفی و دەروونییە پەیدا دەبێت، کە بە هەر شـێوەیەك بێـت دەسـتەویەخەی هـەموو مرۆڤێك دەبێت.

ئەم پرسە وەك پارادۆسێك بە درێژایی مێژوو بیرمەندان وفەیلەسـووفانی بـە خۆیــەوە ســەرقاڵ کــردوە، بــە رەهەنــدە جیاوازەکانییــەوە. بــە لایەنــە شاراوەومەتەڵ شێوەکانیەوە.تا ئەو کاتەی خوا زەوی و دانیـشتوانی بـۆ خـۆی دەباتەوە.

پرسـێکە هــەموو بیروبـڕواو ئـاین و فەلـسەفەکان، رووبـەڕووی بوونەتــەوە. پەیامی پێغەمبەران سەبارەت بەو هاتووە وفرستادە ڕێنمـاو ڕێبـەرەکانیش بـۆ ئەو نێردراون.

روون و ئاشكرایه كه مرۆڤی سنووردار له هۆش و گوتـارو ئـاوەزدا، نـاتوانیٚ بابەتی هەموەكی ورەها و بیٚكۆتایی دەرك بكات، هەربۆیـه پێویـستی بـه چـرا گەلێك هەیه بۆ ئەوەی ڕێگا تاریكەكانی ژیـانی بـۆ روون بكاتـەوەو بیگەیەنێتـه ئامانجەكانی ودەرروونی ئارام و ئاسوودە بكات. هـەروا مانـای بـوون و ئامـانجی بوون و چارەنووسی ئەم بوونەوەرەی بۆ ڕاڤە و روون بكاتەوە، وپێی بلّێـت بـه چ شێوەیەك مامەڵە لەگەلٚ بوون بكات، بۆ ئـەوەی ئـەنجامی باشـی هـەبێت.بـه درێژایی سەردەمەكان ئاین و پەیام وبڕوا میتافیزیكییەكان سەرچاوەی رینوێنی و ئارامش و ئاسوودەیی گیانی مرۆڤ بوون لەم بوارەدا.

وێڕای بڕوای مرۆڤ بەو ئایدیاو ئاینانەی بۆ یەكتری بە جیٚ دەهێلّن و بڕوایـان پییەتی، بەلاّم ژیری مرۆڤ و ئەو سروشتەی خوا پێی بەخشیوە كە بە دوای فام و دەرك وزانیندا بگەڕێت، بۆیـه دەبـوو مـرۆڤ لـه سـەر هـەموو شـتێك پرسـیارو سەرنج وتێكۆشانی ژیرانەی هـەبیٚ، لـەم رووەوە لـه پـەنای بـڕوای سروشـتی و ویژدانیدا، تۆژینەوەی ژیرانه لـه سەرچـاوەی بـوون و مانـای بـوون و ئامـانج و چارەنووسی بـوون، سـەری هەلّداوە، ئەمانـه پرسـیار گـەلێكن كـه فەلـسەفەو فەیلسوفەكان له سنووری تێگەیشتنی هۆش و ژیریدا گرنگی پێداون.

بەم واتایه فەلسەفه دەربڕینێكه له سروشتی دەرك كردنی ژیرانه و ویستنی زانستی ئەزموونگەرانه.

جا ئەگەر مرۆڤ و بیرمەندو فەیلەسووف له سروشتی ئەم پرسه حالّیی بـبن، كاتێـك رووبـەڕووی دەبنــەوە و بـشزانن كـه ژیـری و دەركـی ئـەمان لـه سـەری هەنـدەكی و كەمـە، ئـەوا توێژینــەوە و بیركردنەوەكـەی دەبێتـه ئامرازێـك بـۆ گەیشتن به رووناكیی زانستێكیشیاو و ڕێگایەك بۆ ئارامش و بڕوای زیاتر.

لـەم سـاتە وەختەدایـە کـە زانـستی ژیرانـە، زانـستی بڕوایـی و ئارامـشی دەروونی هەڵناوەشێنێتەوە.

## زانست دەبێ پێگەیشتوو بێت

فریشتەکان زانستێکی پێگەیشتوویان هەبوو، بۆیە بڕوادارو و دڵنیا بوون.

ئەوان کە دەیانزانی سروشتی مرۆڤ لـە دۆخـە حەیوانیەکەیـدا پـێش ئـەوەی خوا ڕێك و پێکی بکات و گیان وهـۆش و زانـستی پـێ بکـات بـە بـەردا، چـۆنە، پرسیاریان بۆ دروست دەبوو لـە سـەر توانـاو سـیفەتە حەیوانیـەکانی مـرۆڤ لـە خراپەکاری و ستەم و دەستدرێژیدا هەربۆیە وەڵامی خوای بەدیهێنەری خاوەنی تواناو زانستی گشتی و ڕەها زیاتر دڵنیا و بڕوای بەهێز کردن.

(وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِـلٌ فِـي الأَرْضِ خَلِيفَـةً قَـالُواْ أَتَجْعَـلُ فِيهَـا مَـن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْـدِكَ وَنُقَـدِّسُ لَـكَ قَـالَ إِنِّـي أَعْلَـمُ مَـا لاَ تَعْلَمُونَ)(٣٠)(وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَـا ثُـمَّ عَرَضَـهُمْ عَلَـى الْمَلاَئِكَـةِ فَقَـالَ أَنبِئُـونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ)(٣١) (قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْـمَ لَنَـا إِلاَّ مَـا عَلَّمْتَنَـا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ) (٣٢) البقرة.

واتە ئەو کاتەی پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو کە من لە سـەر زەوی جێ نشینێك بڕیار دەدەم..ئەوان گوتیان: ئەتۆ مەگەر کەسێك دەکەی بـە جـێ نشین کە خراپەی تێدا دەکاو خوێنی خەڵکی تیـا دەرێـژێ؟ لـە حاڵێکـدا تـەنها ئێمە سوپاسگوزاریی تۆ دەکەین.

خودا فەرمووی ئەوەی کە ئێوە نایزانن من دەیزانم...

ئادەمی فێری ناوەکان کردو ئینجـا نیـشانی فریـشتەکانی دا، دە پـێم بڵـێن ئەگەر ڕاستن ناوی ئەو شتانە چین؟

گوتیـان: پـیرۆز و فەرمەنـدیی بـۆ خودایـە، ئێمـە شـتێك كـە خـۆت فێـرت نەكردبین هیچ نازانین چونكە هەرتۆی هەرە زاناو هەرە دانا...

بەڵام ئیبلیس كە بە زانستە جوزئییەكـەی خـۆی غـەڕڕا ببـو واتـە سـنوور و مەودای خـۆی و دەرك و لـۆجیكی خـۆی نـەدەبینی و لـەو بەهرەیـەی خـوا بـە مرۆڤی بەخشیوە وێڕای ئەو سروشتە حەیوانیە تێكدەرانە، حاڵیی نـەبوو، وەك ئەو "خوێندەوار "ە بێ باوەڕ و یاخیانـەی لێ هـات كـە وا دەزانـن بـەو زانسـتە كەمەی هەیانە، بوونەتە خاوەنی حەقیقـەت و گـەمارۆی هـەموو هۆكارەكانیـان داوە. لـە ئەنجامـدا هـەم ئـەوان و هـەم شـەیتانیش گـومڕاو بـێ بـڕوا و یـاخی بوونە.(إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِن طِينٍ(٧١) فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ(٧٢) فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ(٧٣) إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ(٧٤) قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ(٧٥) قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ(٧٦) ص. (قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلاَّ تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ(١٢) قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ(١٣) الأعراف.

ئیبلیس هەر ئەوەندەی دەزانی كە ئەو لە ئـاگری سـووتێنەر ئەفرێنـدراوە و توخمەكەی ئەم بەرزترە لە توخمی گڵ، كە توخمێكی پەست و كەمە و مرۆڤـی لێدروستكراوە.بۆیە سەری لە لووت بـەرزی و یـاخی بوونـەوە دەرهێنـاو چـاوی كوێر بوو كە ئەو لە كوێ و زانستی بێ سنووری خوا و حیكمەتی و توانـای بـێ كۆتایی خودا لە كوێ؟

بێئاگابوو لە ڕووناکی ئەو گیان و هۆش و تێگەیشتنەی خودا دەیدا بە مرۆڤ.خودای توانا کە ئیدراك و بەرپرسێتی بە مرۆڤ بەخشی بەو کوێری و یاخی بوونە بوو، کە ئیبلیس گومڕاو بێ بڕوا بوو.

کەوابوو، زانستی پێگەیشتووی خواناس، ڕێگەیەکە بۆ بیرکردنەوە و قووڵبوونەوە و ئارامش و بڕوا.

ئەو پرسیارو ڕامانی و بەدواداچوونەی کە فیترەتی مرۆڤ ئەنجامیان دەدات تەنها ڕێگایە بۆ زانستێکی لەو چەشنە و دۆزینەوەی ئەوسنورانەی مرۆڤ دەگەیەنن بە دڵنیایی و بڕواهێنان.

کەواتە هەرگیز دروست نییە کە بگوترێ کە نەزانین و بیر نەکردنەوە و قووڵ نەبوونەوە باشترین ڕێگان بۆ بڕواهێنان.

ئەگەر بشگوترێت کە توێژینەوە و سەرنج وتێفکرین و ڕامان دەمانگەیەنێت بە بێبڕوایی و کوفر ئەوە قسەیەکە وەرناگیرێت.

تەنها کاتێك وەهایە ئەو کەسە کە خودی خۆی دەرك نەکردبێت و ئاگای لە سنووربەندییەکانی خۆی نەبێ و نەزانێت کە زانست و لۆجیکی ئەو بەرامبەر خودا چەند کەم و سنووردارە:

ئەو خودایەی هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرەبەڵگەیە لە سەر شکۆو دەسەڵات و وردەکاری و دەست ڕەنگینی ئەو.

چونکە نەزانی و بیرنەکردنەوەو ڕانەمان..بە هەموو شێوە جیاوازەکانیەوە.
ئەگەر ببێتە هەڵوەشاندنەوەی هۆش و بیرو بەرهەمهێنانی دڵنیایی، کەواتە بۆ خۆیان دەبنە ترس و ڕاکردن و لاوازیی بڕوا...

خۆ بڕواو وێڵداشی متمانەو دڵنیابوون و ئارامش پەیدا کردنە..بە پێ دۆخی هەموو کیانێك و حاڵەتگەل و زانستگەل و توانستەکانی دەرك کردن،کە

سەرەنجام ئاوێزان دەبێ، بە حاڵی بوون لە گەورەیی کردگار و وردەکاری و دەسەڵاتی بێ پایانی ئەو وێران سنوور بەندی زانستەکانی مرۆڤ و لۆجیکەکەی.

لەگەڵ ئەمەشدا نابێت ئەو ڕاستیە فەرامۆش بکەین کە بازنەی زانستەکانی مرۆڤێکی دەشتەکی سادە ئەو تێگەیشتنە ساویلکانەی لە دەشت و بیاباندا بۆی فەراهەم دەبن، جیاوازە لە بازنەی زانستی زانایان و بیرمەندانی شارستانی و تێگەیشنیان...

ئەگەر چی هەردولاش وەك یەك وان، لەوەدا کە دەرك بە سنووری خۆیان و سنووربەندی لۆجێکیان دەکەن و لە گەورەیی بوون و لە شکۆی کردگار حاڵی دەبن.

زانستی پێگەیشتوو بانگەواز بۆ بڕوا دەکات:بەردەوام زانست و زانیاریەکان لە بواری سروشتی بوونەوەرەکان و ئاسۆکانی دا، لە فراوانبوونی و گەشە سەندندان، ڕۆژانە ئاسۆی فراوانتر بۆ تێگەیشتنی لە گەورەیی کردەو کردگار ئاوەلا دەبن و ئەم ئاسۆیاتە دەبنە بواری پان و پۆر بۆ ڕمان و بیرکردنەوە، و دڵنیایی زیاتر بەرهەم دەهێنێ و ئارامش زیاتر بە دەروون دەبەخشن و باوەڕ لە ناخدا قووڵ دەکەنەوە.

بە بێ ئەوەی هیچ لەو راستیانە بگۆڕێت کە سەبارەتبە سنووربەندی مرۆڤ و تێگەیشتنەکانی ئەوو، بێ سنووری و شکۆمەندی کردەو کردگار (الخلق والخالق) و ئامانجە خێر خوازییەکەی گوتران.

گرنگترین ڕاستی لە جیهانی مرۆڤدا بریتیە لە بوونی ئەو بەلام لۆجیکە هەندەکی و سنووردارەکەی مرۆڤ لە ئەنجامدا پەلکێش دەکات بۆ ئەوەی بڵێین کە لە بنەڕەتدا مرۆڤ بوونی نەبوە چونکە لە لۆجیك و جیهانی مرۆڤدا هیچ شتێك بوونی نابێت بە بێ هۆو هۆکارێکی پێشتر.

ئەم لۆجیکە لە ئەنجامدا مرۆڤ دەگەیەنێ بەو ئەنجامەی کە ئەو دەبێ لە بنەڕەتدا هەر نەبوو بێ، چونکە لە لۆجیکی و تێگەیشتنی مرۆڤدا شتێك نییە، لە هیچەوە پەیدا بووبێ، واتە بەم لۆجیکە بێت مرۆڤ نابێ ببێ. لەبەر ئەوەی بە پێی لۆجیك و ئیدراکی ئەو، لەسەرەتادا شتلە هیچەوە دروست نابێ.

دیسانەوە لە لۆجیك و هەستو ئەزموون و تێگەیشتنی مرۆڤدا ئەم گوزارە بێ بەڵگەیە مانا نابەخشێت کە:

(بوون بەم شێوەیە بەردەوام هەربووە).

مرۆڤ هەیە، ئەمە یەکەمین و گرنگترین ڕاستیە کە مرۆڤ دەرکی دەکات و لە بوون و قەوارەی خۆیدا هەستی پێ دەکات.

ئاشکراشە ئەمە دژایەتیەکە لە نێوان بوون و نەبووندا.پارادۆکسەکەش لێرەدا شاراوەیە نەك لە بوون دا، چونکە بوون لە هەستی مرۆڤدا ڕاستیەکەو هەیە، کەواتە دەبێ هۆی کورتهێنانەکە لەوەدا بێت کە کە لۆجیکی مرۆڤ و تێگەیشتنی مرۆڤ سنووردارن.

واتە بوون مل کەچ ناکات بۆ لۆجیکی سنورداری سنووورداری مرۆڤ، بەڵکو بۆ لۆجیکیکێی بەرزتر سەردادەنەوێنێت، ئەوسا ئەمەش دەرك دەکات و رەهەندەکانی خۆیو لۆجیکەکەی دەزانێت، وەك قورئانی پیرۆز گوزارەی دەکات، ئەوساتەی کە گەشتی ژیان و تاقیکرنەوەکانی کۆتاییان دێت و مرۆڤ دەگێزرێتەوە بۆ جیهانی باڵا، کە لەوێدا فرە شتی چاونەدیدەو گوێ نەبیستوو و بە خەیاڵی مرۆڤدا نەهاتوو هەن: (ما لا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر) ١.

[1] - مسند الامام احمد - ژمارەی فەرموودە ١٠١٧٢.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (بل كذبوا بالحق لما جاءهم فهم في امر مـريج – افلم ينظـروا الى الـسماء فـوقهم كيـف بنيناهـا وزيّناهـا ومـا لهـا مـن فـروج – والأرض مددناها وألقينا فيها رواسي وأنبتنا فيها مـن كـل زوج بهـيج – تبـصرة وذكرى لكل عبد منيب – ونزلنا من السماء ماء مباركاً فأنبتنا بـه جنـاتٍ وحـب الحصيد – والنخل باسقات لها طلع نضيد – رزقاً للعباد وأحيينـا بـه بلـدةً ميتـاً كذلك الخروج – كذبت قبلهم قوم نوحٍ و أصحاب الرس وثمود – وعـادٌ وفرعـون وإخوان لوط – وأصحاب الأيكة وقوم تبع كل كذب الرسل فحق وعيـد– أفعيينـا بالخلق الأول بل هـم في لـبس مـن خلـق جديـد– ولقـد خلقنـا الإنـسان ونعلـم مـا توسوس به نفسه ونحن أقرب اليـه مـن حبـل الوريـد– إذ يتلقـى المتلقيـان عـن اليمين وعن الشمال قعيد – ما يلفـظ مـن قـول إلا لديـه رقيـب عتيـد – وجـاءت سكرة الموت بالحق ذلك ما كنت منه تحيد – ونفخ في الصور ذلك يوم الوعيـد – وجاءت كل نفس معها سائق و شهيد– لقد كنت في غفلـةٍ مـن هـذا فكـشفنا عنـك غطاءك فبصرك اليوم حديد) (ق: ٥–٢٢).

بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم بابەتە نموونەیەك دەهێنینەوە، تاوەكوو بۆ زەینمـان نزیك بێتەوە.

ئێمە دەزانین ئشیلە یـان هـەر گیـان لـە بـەرێكی تـر هەرچـەن زیـرەك بێـت ناتوانێت لە هاوكێشەیەكی بیركاری تێ بگات، بەڵام ئەمە ئـەوە ناگەیـەنێت كـە پشیلە – وەكوو ئەوەی پشیلەیە – گێلـە، هـەر واتـە بـەو مانایـە نیـە كـە ئـەو هاوكێشە بیركارییانە هەربوونیان نیە لە بەر ئەوەی پشیلەو گیـان لـە بـەرەكان تییان ناگەن.

بەڵكو ئەمە ئەو مانایە دەگەیەنێت بە بەراورد لەگەڵ مـرۆڤ كـە تێگەیـشتنی پشیلەو گیان لە بەران سـنووردارە و ژێـری ئـەوان لـە چـاو ژیریـی تێگەیـشتنی

مرۆڤدا، سنووربەندە، ئاستی ئەو تێگەیشتن و ژیرییـە هەرچـەند بێـت، چـونکە هاوکێشەکان دەکەونە مەودای ژیری و لـۆجێکی گـەلێك بـەرز لـە هـی گیـان لـە بەران و پشیلە.

کاتێکیش شەیتان نکۆڵی کرد لەوەی زانیاری دروسـتکراوان و داناییـان بـە بەراورد بە زانست و حیکمەتی خوا سنووربەندە،ئەوە بە مانای خـۆ بـە گـەورە دانانێکی زشت بوو کە بوویە داوێك و ئیبلیسی تێکـەوت و هەنووکـەش زۆر لـەو مرۆڤانەی لووت بەرزو بێ بڕوان گرفتاری دەبن.

یەکێك لەو راستیانەی مرۆڤ دەیزانێت و لە ناو مرۆڤیشدا پێش هەموو کـەس "زانـا " لووتبـەرزەکان دەیـزانن، ئەوەیـە هـەر کـە مـرۆڤ ئاسـتێکی بـەرزتر لـە لۆجیك دەدۆزێتەوە، شتانێك دەبینێت کە زووتر نەیدەبینی.

بۆ نمونە زۆر راستیەکانی زانست و تایبەتمەندی و خەسـڵەت و وزە ە بـارگر و توانستە شاراوەکانی ماددە، لە ڕەهەندی وردو پەنهانی ئەتۆمدا گۆرانیان بـە سەردا هاتووە، بە پێچەوانەی ئەو راسـتیە زانـستیانەی لـەوە و پـێش لـە سـەر رەهەندی بەرهەست و سادەو ئاشکار هەبوون، هەنووکە میتاڵەکان، بێ گیـان و بێ جووڵە نین، هەرهەموویان لە ڕەهەندی ئەتۆمدا دەبزوون و تا مادە جێگیرتر و چڕتر و بە ڕواڵەت بێ جووڵە تر بێـت، ئـەوە بزاڤـە ئەتۆمیـە شـاراوەکەی بـە هێزترو گەورەترە.

ماددە ئەمرۆ ئەوەنیە کە لە ڕەهەندی تەقینەوەی ئەتۆمیو هایدرۆجینیدا " تیا ناچێت و دروسـت نابێـت، بـەڵکو ئـەمرۆ لـەو بوارانـەدا مـاددە هـەم لـە نـاو دەچێت و هەمیش بەدی دەهێنرێت.

ئەو پلە گەرما زۆربەرزەی کە جاران بە خەیاڵدا نەدەهات، تەنانەت بە سووتاندنی هەموو دارستانەکانی سەرزەوی ئەمڕۆ بە ئەندازەیەکی کەم ماددەی تیشکدەرەوە دەگونجێت رووبدات.

هەموو ئەمانەو زیاتریش لە ئاسۆکانی زانستەکاندا ریَ تیَ دەچێت، وپیچمان دەلچێت کە زانستی مرۆڤ سنووری هەیە و ژیری و تێگەیشتن ئەو بەراورد ناکرێت لەگەلَ زانستی خوای ئەفرێنەری بە توانای و داناو ڕەها، کە لە جوان ئەفراندن و وردەکاری بوونەوەردا خۆی بۆ مرۆڤ نمایش دەکات. بە جۆرێك کە مرۆڤ ناتوانیَ وەرینەگرێت، ئاستی زانست و هۆشیاری و دەرکی هەرچەند بێت.

(قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ(٥٢) سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الافَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (٥٣) فصلت.

(هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (٣) الحديد.

من لە گوتارێکدا بە ناونیشانی (دووبارە خوێندنەوەی رواڵەت گەرایی ئیبن حەزم) بە درێژی باسی ئەو هۆکارانەم کردووە کە بناغەی بڕوای پتەوم بوون و هەن بەوە کە پەیامی ئیسلام سرووشێکی خواییيە.

لە قۆناغی بەرایی ژیانی هزریمدا، لە سەر مێزی خوێندنی دواناوەندی لە شاری مەککەی پیرۆز بوو، ئەو خاڵە روون دەکاتەوە کە پرانسیبەکانی بەدواداچوونی زۆر پرس و دووبارە خوێندنەوەیان بە بیَ ترس و دڵە ڕاوکیَ نەگۆراو، چ وەکوو بیرکردنەوەیسەرنج لێدان و چ وەکوو بەدواداچوونی راستی و زانیاری.

خـوا یـار و پـارێزەر بێـت، مـن بـەم بڕوایـەوە کـە بـە ناخـەکانی دەروونمـدا ڕۆچووە و بیرم ڕێنمایی دەکاو ڕێگام بۆ ڕاست دەکاتـەوە و بـە ڕەفتـارم ڕەوت دەبەخـشێت، لـە بەرامبـەر ئـەو هـەموو رامـان و سـەرنج و بۆچـوونانەوە کـە بـەرپادەبن و لـە خاترمـدا پـەنگ دەخۆنـەوە، هـیچ تـرس و دوودڵییـەکم نیە،تەنانەت ئەگەر لە بەرامبەریەوە رابمێـنم و هۆشـم نـەتوانێت لـە خـۆی ولـە حیکمـەتی شـاراوەی تـێ بگـات، بـڕوام بـەم پەیامـە ناگۆرێـت و تێگەیـشتنم سەبارەت بە شکۆی کردگار، وناوازەیی کردەکـانی و توانـاو حیکمـەتی کـاریو جوانی بەڕێوەبردنی ئافەریدەکانی وەك خۆیەتی، لـە هـەمان کاتـدا بـە تـەواوی تێدەگـەم لـەوەی کـە مـن وەك مـرۆڤ سـنوورێکم هەیـە، توانـای لۆجیـك و زانستەکەشم سنوورێکی هەیە، بۆیە لە نێوان پرسیارە هەنـدەکی و تێفکـرین و ڕامانەکانمدا شتێك نابینم لەگەڵ بڕوای گشتگیرم بە خوداو بە پەیام و بە غەیب دژو ناتەبا بێت. لـەم ڕووەوە پرسـیارو لێکۆڵینـەوە بـە دواداچـوون و تەنانـەت جارو بار ڕامانیش هیچ نین جگـە لـە ئـامراز گـەلێك بـۆ قـووڵ بوونـەوەی بـڕواو متمانەم بە خودا و زیاتر پاڵم پێوە دەنێن بۆ ئەوەی بڕوای نـەگۆڕم هـەبێت بـە تواناو زانست و دانایی شکۆداری ئەو، لە هەمان کاتدا کـە لـە بـێ دەسـەڵاتی و نەزانی خۆم حاڵییم دەکات بێ گومان ئەوەشـم بـۆ دووپـات دەکاتـەوە کـە مـن دەرك و ژیرییەکی سنوردارم هەیە.

ئەم وتارە بۆ ئەوەیە کە حەز دەکـەم خوێنـەر لـە گەڵمـدا بەشـدار بێـت بـۆ وەڵام دانەوەی یەکێك لەو پرسیارو سەرنجە قورسانەی بە خەیاڵمـدا دەهـاتن و لەسەرەتادا زۆر قورس بوون بۆ تێگەیشتن و فام وژیریی من.

بەڵام بە تێفکرین و سەرنج دان لێی وا بزانم هەنگاوێکی دوورترم ناوە، کە لە ناخەوە هەستی حەقیقەتخوازیم خۆشنوود دەکات، بەو ئەندازەیـەی کـە خـوای

پەروەردگار عەقلێ و لۆجیك و تێگەیشتن و هەستی بەڵگە هێنانـەوەی بـە مـرۆڤ بەخشیووە.

## کێشە

پرسی جێی بیر کردنەوە لەم نوسینەدا پەیوەستە بـە ڕواڵەتێکـەوە کـە زۆر جـار بـیر و سـەرنجی منـی ڕاکێـشاوە زۆر جـار لـە خـۆمم پرسـیوە ئـەبێت چ مانایەکی هەبێت چ حیکمەتێکی لە پشتەوە بێت، ئەم دیاردەیـەش بریتییـە لـە سوڕی ژیان بە شێوەیەك کە هەندێك لە گیان لە بەران بۆ ئەوەی بمێنن و بـونی خۆیان بپارێزن پێویست دەکات دەست درێژی بکـەن بەسـەر ئـەوانی دیکـەدا و یەخسیریان بکەن کە ئەمە لە هزری خۆرئاوادا بە (یاسای جەنگـەڵ) و (مانـەوە بۆ چاکتر واتە بـۆ بـەهێزتر) نـاوزەد دەکرێـت، بـۆ نمونـە زینـدەوەر و خـشۆکە بەهێزەکان بە هەموو ڕەگەزەکانیانەوە لە ووشکانی و دەریاو حەوادا بۆ ئەوەی بژین پێویستە زیندەوارانی دیکە ڕاو بکەن بـە تایبـەنی ئـەو زیندەوەرانـەی کـە لاوازترن، ئەبێت شێر کەڵەکێوی ڕاو بکات، گـورگ پـەلاماری ئاسـك و بەرخۆلـە بدات، ڕێوی کەروێشك و هـەڵۆ کـۆتر و یەخـسیر بکـات، ئـیتر باسـی مـرۆڤ هـەر مەکە کە هەزاران ئاسك و کەروێشك و کۆتر و ئاژەڵ و بەرخ و مریشك لـە ژیـانی خۆیـدا دەکاتــە قوربــانی، ســالآنە مرۆڤایــەتی ملیۆنــەهایان لێ ڕاو دەکــات. پرسیارەکەش ئەمەیە بۆچی دەبێت ئەم گیان لە بەرانە بە شـێوەی جیـاواز لـە سـەر پـەلامار و ئـازاردانی ئـەوانی دیکـە بـژین و درێـژە بـە بـوونی خۆیـان بدەن؟ئەوەی ئەم پرسیارەی بە توندی لە ناخمدا دروست کرد ئـەو هـاوارە پـڕ لـە تـرس و ئـازارەی کەروێـشکێك بـوو کـە هـەرگیز لـە بـیرم ناچـێت کاتێـت پشیلەیەك پەلاماری داو چنگ و کەڵبەکانی لە ملی گیر کرد ئیدی ئەو هاوارە پڕ

لـه تـرس ئـازارەی کـرد کەروێـشکیش بـۆ خـۆی ئـەو زینـدەوەرە دەسـتە مـۆ شەرمنەیە کە بە ئەستەم دەنگی لێوە دێت.

سروشتییە کە ئەوەمان بە خەیاڵدا بێت کە سووڕی ژیان و هاوسەنگی نێوان جۆرەکان و ئەو تۆکمەیی و سەنعەتەی خزمەت بە مرۆڤ دەکات و بە ژیان بوون و بەردەوامی دەبەخشێت هەموو ئەمانەدەخوازێت، کە بێگومان ئەمە حیکمـەت و ووردەکاریەکـەلێی تێدەگـەین ئەگـەر بـە لامانـەوە بەڵگـە نەویـست بێـت کـە هاوسـەنگی تـەنها بـەم سیـستەمەو بـەم سـووڕی ژیانـەی سـەر زەوی بـەم ڕێکخستنەی لە بەر چاومانە دەستە بەر دەبێت.

بەڵام پرسیارەکە لە سەر توانایی بێ سنووری خوایە کـە ئەگـەر بیویـستایە سیستەم و ڕێکخستنێکی دیکەی دادەنا کە هـەم هاوسـەنگ بێـت بـەردەوامیش بێت بە بێ ڕاوکردن و ڕەنج و ئازاریئـەم گیان لەبەرە بەسەزمانانە.

تەنها ئەوەندەم پێ کرا کە سەرنج بدەم و لە خۆم بپرسم هەرچەندە ئاسـان نەبوو بە لامەوە کە لە ماناو حیکمەتی فراوانتری ئەم شتە تێ بگەم، کاتێك ئەم بۆ چونەم لەگەڵ چەند برادەرێکدا خستە بـەر گفتـوو گـۆ بـۆ ئـەوەی سـەرنجی بدەن و هەوڵی وەڵامی ئەم پرسیارە بـدەن کـە لـە خولیـام دا بـوو سـەرنجم دا (ناهەقیشیان نەبوو) کە لەم پرسیارە دەترسن و چونکە بابەتێکی ئاسـان نییـە لە وەڵامەکانیاندا خود بەخود باس لە گرنگی ئازار چەشتن و تەنانەت پێویستی و شیرینی ئەو ئازارە دەکەن لە ساختی ژیانو چێژوو پێکهێنانیـدا هەڵبەتـە مـن لە مانـاو پێویـستی ئـەو دەردو ئـازارەی کـە ئاسـك لـە ژێـر کەڵبـەی گـورگێکی بیاباندا دەیچێژێ حاڵی نـەبووم یـان ئـەوەی کـە نەهـەنگ و ماسـی لـە تـاریکی دەریاکاندا پێی دەگات، خۆ ئەگـەر خـوای کـار بـەجێ بیویـستایە بـە جـۆرێکی دیکە دەبوو.

لێرەوە تێ گەیشتم کە ترس لەم بابەتـە سەرچـاوەکەی بریتییـە لـە تێکـەڵ کردنی بیرو بڕوا لەلایەك و پرسیارەکان بۆ تێگەیشتن و دەرك کردن لە لایـەکی تر، بە ڕای من کە هیچ دژایەتییـەك لـە نێوانیانـدا نییـە چـونکە بـیرو بـاوەڕ لـە چەمکە گشتی و تێڕامانەکان دروست دەبێت بەڵام پرسیارەکان لە وردکردنـەوە و چەمکە هەندەکییەکان سـەرهەڵ دەدەن، واتـا بـە چـاو پۆشـی لـە ئـەنجامی پرسیارەکەم و سنووری گەیشتن بـە مانـای ووردو یـان مانـای بەشـێکی دیـاری کراو لە ژیان و لە بوون، تێگەیشتن و بـڕوای گـشتی بـە دەسـەڵات و حیکمـەتی خودا گۆڕانی بە سەردا نایەت ئەو دەسەڵات و حیکمەتەی کە هـیچ مـەرج نییـە بکەونە ژێر ڕکێفی دەرك و لۆجیکی سنورداری منـەوە، بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا ئەم ڕاستییە ئەرك و حەزی من هەڵ ناوەشێنێتەوە بۆ بیرکردنەوەو تـێ فکـرین و وورد بونـەوە بـەو ئەندازەیـەی کـە دەرك و لۆجیـك و بـیر کردنـەوەو هۆشـم ڕێنماییم دەکات چونکە ئەمە دەبێتە زانست و یەر چاو ڕوونی بۆ من مادام ئـەم تۆژینەوەو تێڕامانە تێکەڵ بە فیزو لە خۆ دەرچوون نەبن.

وێـڕای ئەمەبـە تێفکـرین و ووردبوونـەوە مـرۆڤ دەگاتـە بـەرزترین ئاسـتی تێگەیشتن و ئاسۆی زانستەکانی فراوان دەکات، وەکو ئامڕازێك بۆ تێگەیـشتنی سرووش و پەیام و ڕێنمایـەکانیان لـە کاروبـاری ژیـان و بـژیوی مـرۆڤ ، بـەڵام ئەمـە مـرۆڤ لـە ئـەرکی بەدواداچـوون و تێگەیـشتنی دروسـت دانامـاڵێ، بـەڵکو پێویـستەهۆشی ڕێنـاس جێگـەی جـەخت و متمانـە بێـت و لەگـەڵ سرووشـدا یەکانگیر بێت بـۆ تێگەیـشتنی شـەریعەت و تەشـریع، و بـە کاریـان بهێنێـت لـە کاروباری ژیانداوەکو ئەوەی خوا ویستوویەتی ئەم دوانە ڕووناکیو ڕێنمایی بن بۆ جیهانیـان، بـەڵام بەکارنـەهێنانی هۆشـی موسـڵمان و متمانـە پێنـەکردنی و بانگێشە بۆ بەدوادا چوونی کوێر کوێرانەو پـشتکردن لـە بـاس و تێفکـرین و لـە

تێگەیشتنی یاساو رووداوەکان، هەموو ئەمانە دەچنە خانەی تێکەڵ کردنی بڕواو خۆ بەزلزانینەوە کە بەشێوەیەك لە شێوەکان سەردەکێشێ بۆ بێدەسەڵاتی و گومڕابوون.

دەردی هەستکردنم بەم ڕامانەو بێدەسەڵاتیم لە تێرکردنی سروشتی خۆم بۆ تێگەیشتن و دۆزینەوەی ڕاستییە شاراوەکان بەوە لە سەرم سوك بوو جارێکیان لاپەرەی کتێبێکی یەکێك لە پێشەوا بەرزەکانم هەڵدەدایەوە (ئەگەر بەهەڵەدا نەچوو بم ئیبن قەییمی جەوزییە بوو)، بینیم ئەویش هەمان پرسیاری لە خۆی کردبوو، وەڵامێکی نزیك لەمەی دابووەوە کە لە ناخمدا جێگیر ببوو، کە متمانە بە دەسەڵات و حیکمەتی خودا و سنوور مەندی دەرکی مرۆڤانەی ئێمە سەرەنجام ئەگەر نەشگەین بە وەڵامێکی هەستپێکراو یان ژیرانەی تەواو وامان لێ دەکات بابەتەکە حەواڵەی خۆی بکەین و دڵنیاش بین لەوەی حیکمەتێکی تەواوی تێدایە کە بۆ لۆجیك و توانایژیری ئێمە نادۆزرێتەوە ئەو توانا ژیریانەی ئێمە کە سنووردارو کورتبڕن.

لەگەڵ ئەم سوککردنەدا پرسیارەکە لە ناخمدا هەر وەك خۆی بێ وەڵام و بێ دەرکی ژیرانەی تەواو مایەوە هەرچەندە دەشم زانی کە من رشنگە هەرگیز نەگەمە ڕاستەقینەو ڕوی رشاستی تیایدا ڕەنگەش لە بەر ئەوەش بیچت کە دورترە لە سنووری دەرکی من و لۆجیکی من، ئەگەر چی ئەمە بێگوومان ڕێگە لە عەقڵی من ناگرێت کە بە دەوریدا هەڵسووڕێت هەرکاتێك پەیوەندی بەوەوە بوو یان لە دوورو نزیکەوە باسی لەسەر کرا، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان بگات بە وەڵامێکی باشتر بۆی.

## پێناسەی زیندەوەر: ژیانێکی گڵین و بێگیان

بۆ تێفکرین لە هەر پرسێك، پێویستە لە بناماکانی وردببینـەوە، ئـەویش بـە پێی متێـودێکی فرەلایـەن کـە هـەموو رەهەنـدەکانی بگرێتـەوە و بیانبەسـتێت بەیەکەوە و تیشك بخاتە سەر ئاڵۆزییەکانی.

سەرچـاوەی بنـەڕەتی بـۆ تێگەیـشتن لـە بـوون و بوونـەوەر و یاسـا گـشتییەکانیو پەیوەنـدی نێوانیـان، دەگەڕێتـەوە بـۆ خـودای داهێنـەر و ئەفرێنەریان و هەروەها بۆ ئەو سرووشی کە خودا بە مرۆڤی ناردووە سـەبارەت بە کاروباریان، بۆ ئەوەی مـرۆڤ بـەکاریان بهێنێـت و ڕێگاکانیـان بگرێتـە بـەر و مافی خۆیانیان پێ بدات.

قورئانی پیرۆز وتەی خوداو پەیامی دواهەمین ئەوە بۆ مـرۆڤ و هـەر ئـەویش سەرچـاوەو چـاوگەیە بـۆ تێگەیـشتن لـە یاسـا گـشتییەکانی و پەیوەندییـە بوونەوەری و ئامانجدارەکان، هـەر بۆیـە کلیلـی تێفکـرین لـەم پـرس و بابەتـە بریتییـە لـە وردبوونـەوە و تێفکـرین لـە قورئـانی پیرۆز،هـەتاوەکو ئـەوەی کـە دەشێت لە یاساو ڕێسا گشتییەکانی ژیان و کیـان و بـوونی مـرۆڤ تێبگـاتو فـام بکات.

لـــەم ڕووەوە مـــن هەوڵمـــداوە کـــە لـــە بابـــەتی سروشـــتی زینـــدەوەر و چەیوەندییەکانی تەنانەت ئەوەی چەیوەندی بە مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تـرەوە هەیە وردببمەوە و تێبفکرم، بۆ ئەمەش گەڕاومەتـەوە بـۆ قورئـانی پـیرۆز واتـە سەرچاوەی غەیبیات و کوللیات، بۆ ئـەوەی بـەڵکو تروسـکاییەك لـە روونـاکیم دەست بکەوێت و یارمەتیم بدا بـۆ تێگەیـشتنی سروشـتی دروسـتکراون و ڕاڤـە کردنی بەشێك لە پەیوەندییەکانیان و ئامانجی ئەوانە، بەو هیوایەی ئـەوەی لـە

ئەنجامی لەمهەوڵـەدا دەسـتم کـەوتووە، لـە کتێبیخـوداوە بـۆ تێگەیـشتن لـەم بابەتە و قووڵ بوونەوە لە هەندێك لایەندا، سوود بەخش بێت.

ئێە دەزانین کە ڕووناکی و ئاگر و گـڵ لـە جیهـانی ئێمـەدا هـەموویان دۆخ و شێوەی جیاوازن بۆ وزە،وزەش تا بە ئەمڕۆ شتێکی نەزانراوە بۆ زانستی مرۆڤ. لە قورئانی پیرۆزدا بە ئاشکرا ئاگری تێکدەررو بڵێسەدار بەرزو بڵندترە لە گڵـی وەستاویمردوو، هـەربۆی ئیبلیـسی دروسـتکراو لـە ئـاگر، ڕازی نـەبوو سـوژدە ببات بۆ ئادەمی دروستکراو لە گڵ.

(قَالَ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ) (١٢) الأعراف.

(شەیتان) وتی من لەو باشترم (چونکە) منت لە ئاگر خوڵقاندوە و ئـەوت لـە گڵ.

(قال اسجد لمن خلقت طينا) (الإسراء: ٦١).

(شەیتان) وتی: ئایا سوژدە ببەم بۆ کەسێك کەلەگڵ خولقاندووتە؟

(خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ (١٤) وَخَلَقَ الْجَانَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ) (١٥) الرحمن.

خودا مرۆڤی لە گڵێکی سوورەوەکراوی وەك سوفاڵ، جنۆکەی لە تێکەڵێکی ئاگر ئەخراند.

(قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ) (٣٣) الحجر.

وتی: هەرگیز ناشێت سوژدە بۆ مرۆڤێك ببەم کە لە گڵێکـی سـوورەکراو کـە پێشتر قوڕێکی مایەوە بووە دورستت کردوە.

لـە هـەمان کاتـدا دەبیـنین قورئـانی پـیرۆز هەمیـشە ئـاگری رەنـج و سـزادا ناوبردووە،

بۆ نموونە:

(أُوْلَـئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللّهُ يَـدْعُوَ إِلَـى الْجَنَّـةِ وَالْمَغْفِـرَةِ بِإِذْنِـهِ وَيُبَـيِّنُ آيَاتِـهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ) (٢٢١) البقرة.

ئەوانــە خــەڵكی بـانگ دەكـەن بـۆ ئـاگر ــ وخـوداش بانگیـان دەكـات بـۆ بەهەشت و لێخۆشبوون بە مۆڵەتی ئەو.

(يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَـاتِ أُوْلَــئِكَ أَصْـحَابُ النَّـارِ هُـمْ فِيهَـا خَالِـدُونَ) (٢٥٧) البقرة.

(لە خوا یاخی بووان) خەڵكی لە رووناكییەوە دەردەكەن بۆ تاریكییـەكان ــ ئەوانن خەڵكی ناو دۆزەخ كە هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە.

(تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ) (٣٥) الرعد.

ئەمەیە سـەرەنجامی ئەوانـەی پارێزگـارن، ئـەنجامی بـێ بڕوایـانیش ئـاگری دۆزەخە.

(كُلَّمَا أَوْقَدُواْ نَاراً لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللّهُ) (المائدة:٦٤).

هەر كە ئاگرێك هەڵكردایە بۆ جەنگ و هەرا. خودا دەیكوژاندەوە.

(وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَـا تَأْكُـلُ الْأَنْعَـامُ وَالنَّـارُ مَثْـوًى لَّهُـمْ) (١٢) محمد.

ئەوانەی بڕوایان بە حەق نەهێناوە ڕادەبـوێرن و دەخـۆن هـەروەكو ئـاژەڵ، سەرەنجام ئاگر دەبێت مەنزلیان.

سروشـتی ئـاگر بەسـتراوە بــە ڕووناكییــەوە. بــەڵام ئــاگر لــە دۆخێكــی تێكدەردایـە، بۆیـە ئیبلـیس لـە فریـشتەكان بـوو، كەچـی یـاخی بـوو، واتــە سروشـتەتێكدانەكەی و زیانگەیاندنەكـەی زاڵ بـوو بـە سـەریدا و سەرپێـچی لـە فرمانی خوداوەند كرد.

ئەوەش بزانین جنۆکەی خولّقێنـدراو لـە ئـاگر هەیانـە بـڕوادارو گوێڕایەڵـە و هەشیانە تاوانبارو سەرکەشە.

جا لەبەر ئەوەی سروشتی ئیبلـیس سروشـتێکی ئـاگرین ودەردهێنـەر بـوو، کاتێك ڕووی لە تاوان کرد، لە فرمانی خودا یـاخی بـوو، هـەروا ڕوویکـردە رق و کینـە دەرحـەق بـە مـرۆڤ و زیـان پێگەیانـدنی و هەڕەشـە لێکردنـی و گـومڕاو تاوانبارکردن و پالّ پێوەنانی بەرەو ئاستێکی گلّێن نزم و هەرچی لەم ئاستەوە پەیـدا دەبـێ وەك ئـارەزوو بـازیی یاسـای دارسـتانی ئاژەڵیانـەو خووخـدەی ئاژەڵیانەو ڕەگەز پەرستی و شەڕەنگێزی و شەهوەتبازی ئاژەڵیانە.

(وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَـسَجَدُواْ إَلاَّ إِبْلِـيسَ قَـالَ أَأَسْـجُدُ لِمَـنْ خَلَقْـتَ طِيناً(٦١) قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَـذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَـهُ إَلاَّ قَلِـيلاً(٦٢) قَـالَ اذْهَـبْ فَمَـن تَبِعَـكَ مِـنْهُمْ فَـإِنَّ جَهَـنَّمَ جَـزَآؤُكُمْ جَـزَاء مَّوْفُوراً(٦٣) وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِـصَوْتِكَ وَأَجْلِـبْ عَلَـيْهِم بِخَيْلِـكَ وَرَجِلِـكَ وَشَـارِكْهُمْ فِـي الأَمْـوَالِ وَالأَوْلادِ وَعِـدْهُمْ وَمَـا يَعِـدُهُمُ الـشَّيْطَانُ إِلاَّ غُـرُوراً(٦٤) إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلاً) (٦٥) الإسراء.

قَـالَ رَبِّ بِمَـا أَغْـوَيْتَنِي لأُزَيِّـنَنَّ لَهُـمْ فِـي الأَرْضِ وَلأُغْـوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِـينَ(٣٩) إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ(٤٠) قَالَ هَذَا صِرَاطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ(٤١) إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ(٤٢) وَإِنَّ جَهَـنَّمَ لَمَوْعِـدُهُمْ أَجْمَعِـينَ) (٤٣) الحجر.

بـەڵام نـوور و ڕوونـاکی کـە هەرهـەموو باشـەیە، بـۆ خـۆی سـیفەتێکە لـە سیفەتەکانی خودا (اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ) (النـور: ٣٥)، لـە هـەمان کاتـدا سیفەتی ڕاستی و چاکە و هیدایەتە (اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْـرِجُهُم مِّـنَ الظُّلُمَـاتِ إِلَى النُّوُرِ) (البقرة: ٢٥٧).

(فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا) (التغابن: ٨).

(وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ) (الشورى: ٥٩).

قورئانی پیرۆز، مانگی رووناك و رێشاندەریشی بە نوور وەسف کردوە، خۆریش،کە ڕووناکی و گەرما بڵاو دەکاتەوە، نەك ڕەنج و وێرانکردن، قورئان بە ڕووناکی (چیاو) و چرا (سراج) ناوی بردووە، نەك ئاگر، بە پێی ئەو کاریگەرییەی لە ژیانی مرۆڤدا هەیەتی، چونکە تیشك و ڕووناکی دۆخێکی وزەیە کە بەخشش و سوودی هەیە، و ویٚ کاری ناکات، هەروەها چرا ئاگرێکی ڕۆشنگەرە، تیشك و رووناکی پەخش دەکات، بە پێچەوانەی ئاگری سووتێنەری لەناوبەر کە تەنانەت سوودەکەشی لە رێی وزەی وێرانکاری و گۆڕاندنەوەیە.

(هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاء وَالْقَمَرَ نُوراً) (یونس: ٥).

(وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُوراً وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً) (١٦) نوح.

(كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ(٤) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ(٥) نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ) (٦) الهمزة).

(كَلَّا إِنَّهَا لَظَى(١٥) نَزَّاعَةً لِّلشَّوَى) (١٦) المعارج.

ڕووح بۆ خۆی لە لای خواوەیە و بەشێکە لە فرمان و لە رووناکی ئەو رەهەندی بەرزیی و کەماڵ وچاکەی مرۆڤ دەنوێنێت و نیسبەت دەدرێت بۆلای خودای پەروەردگار:

(ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ) (السجدة: ٩).

(فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُ سَاجِدِينَ) (الحجر: ٢٩).

(وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً) (الاسراء ٨٥).

(قُـلْ نَزَّلَـهُ رُوحُ الْقُـدُسِ مِـن رَّبِّـكَ بِـالْحَقِّ لِيُثَبِّـتَ الَّـذِينَ آمَنُـواْ وَهُـدًى وَبُـشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ) (النحل: ١٠٢).

(نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ) (الشعراء: ١٩٣).

ڕوون و ئاشکرایە کە ئێمە ڕووبوڕووی بوونـەوەرێك دەبینـەوە، کـە لـە سـێ ڕەگەز پێکهاتووە:

- ڕووناکی. ڕووحی مرۆڤ لە نوور خولقاوە و دەگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوداو لە ئەو هێز وەردەگرێت، و ئاگر و گڵ:
- ڕووناکی لە خواوەیە و سەرچاوەی ڕێنمایی و قازانجی مـرۆڤ، و گیـانی مرۆڤ لەوەوە دەمێندراوە.
- ئاگری بڵێسە داری لە ناو بەر، کە ئیبلیس و جنۆکەی لێ دروستکراوە.
- گڵێکی وەستاوی بێ گیان، بە پلە پایەی نزمەوە، کە جەستەی مرۆڤ و هەموو زیندەوەرانی لێ دروستکراوە.

کـەوابێ هـەر خـودای ئەفرێنـەر و ڕینمـا ڕوونـاکی ئاسمانـەکان و زەوییـە، ئیبلیس کە شەیتانی شەڕ خوازە لەو ئاگرە تێکدەرەیە، هەرڤی زیندەوەری بێ (ڕووح) هەیە لەو گڵ و قوڕو لیتەیە، بەڵام مرۆڤ تاقانە گیاندارێکە کـە ڕوونـاکی رووحی بڵند و ڕەشایی گڵی پەست و بێ گیانی لەودا کۆبوونەتەوە.

## مرۆڤ: ڕووناکی و گڵ، ژیانێکی جاویدان (نەمر)

ئەوەی گرنگە لەم باسەی ئێمەدا، بریتییـە لـە جەسـتەی مـرۆڤ، کـە وێـڕای هەمەە گیاندارانی سەر زەوی لە خـاك دروسـتکراون، سـەرنج بـدەین سروشـتی هەموو ئەم گیاندارە گڵێنانە پێویستیان بەوەیـە یـەکتری ڕاو بکـەن بـۆ ئـەوەی بمێننەوە و ژیانیان بەردەوام بێت.

بەڵام کە سەرنجی مرۆڤ دەدەین دەبینین کە مرۆڤ تاقە گیانلەبەرێکە کە ڕووحی پێدا دەمێنراوە، کەواتە هەر مرۆڤ بۆتە حێی ژوانی ڕووحی ڕووانك و ماددەی چڕ و نزمی گڵێن، لە هەمان کاتدا تەنها مرۆڤە کە بەسەر زەویدا بڕوات و ڕووناکی سروشتی شەریعەتە نوورانییەکانی خودای ئاراستە کرابێت، بۆ ڕینمایی و ڕاستکردنەوەی ژیانی، بە پێچەوانەی یاساو ڕیساکانی جەنگەڵ، کە سروشتی گیان لە بەرەکانی دیکە بەرشیوە دەبات، ئەوگیان لە بەرانەی تەنها دەژین و هەناسە دەدەن واتە جەستەیان لە گڵە و ژیانیان بە هەناسەیە، هەربۆیە بەو گیانە هاوبەشەی نێوانیان مرۆڤ و گیان لەبەرانی دیکە دەگوترێت (نفس):

(كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ)(٥٧) العنكبوت.

دیارە مرۆڤ لە حەیوان و شەیتان بەوە جیا دەبێتەوە کە " ڕووح " ی هەیە:

فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُ سَاجِدِينَ(٢٩) الحجر

حەیوانیش لە ژیاندا وەکوو مرۆڤ وایە، جوستەیەکی گڵێنی هەیە هەناسە دەدات و دەژی، ژیان و هەناسە دانیش هەردەبێ کۆتایی یان پێ بێت، و جەستەش هەردەبێ بمرێت و لە ناو بچێت، بەڵام حەیوان " ڕووح " و " ئیدراك " و " ویژدان " ی نییە، تەنها بە یاسای جەنگەڵ و گڵ بەڕێوە دەچێت، واتە لە هەرکوێ یاسای هێز و ماف مافی بە هێز هەبێت، بە پێچەوانی مرۆڤ کە شەریعەتی ڕووناکی و ڕووح بەڕێوەی دەبات، واتە لە هەر کوێ هێز هێزی ماف بێت.

ئەوەتا خوای چەروەردگار لە بارەی گیانی حەیوانییەوە کە لە مرۆڤدا هەیـە دەفەرموێت (وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَـا رَحِـمَ رَبِّـيَ إِنَّ رَبِّـي غَفُورٌ رَّحِيمٌ(٥٣) یوسف

بەڵام لە بارەی خودی مرۆڤەوە بە پێکهاتەی ڕووح و گڵەوە، دەفەرموێت:

(وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ)(١٠) (فلااقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ)(١١) البلد.

(إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً)(٣) الإنسان.

(وَأَمَّا مَنْ خَـافَ مَقَـامَ رَبِّـهِ وَنَهَـى الـنَّفْسَ عَـنِ الْهَـوَى) (٤٠) (فَـإِنَّ الْجَنَّـةَ هِـيَ الْمَأْوَى)(٤١) النازعات.

کەواتە گیان لە بەرانی دیکەش وەکوو مرۆڤ دەژین، بەڵام سروشتی ڕووحـی مرۆڤ لە هی گیان لە بەران جودایە.

هە بۆیە خودی مـرۆڤ خـودێکی دووانەیـە و پێکهاتـەو سروشـت و ئامـانج و یاسایەکی بە تەواو جیاوازی هەیە لە پێکهاتە و ئامانج و یاسای گیـان لەبـەران، باوەکوو لە شتێکدا هاوبەشیش بن.

بۆیە کە سەیری مـرۆڤ دەکـەین، دەبیـنین لـە پـەنای جەسـتەو پێداویـستیە ماددییەکانیـدا، و لـە پـەنای ئـەوەی پەیوەسـتە بـە ئارەزووەکـانی و عـەیب و عەورەتەکانی و هەرچی مرۆڤ دەبات بە لای سروشـتی گـڵ و یاسـای جەنگـەڵی حەیوانیدا، لایەنی ئیدراك و دەروون و بەرزبوونەوەش هەیـە کـە بەسـتراوە بـە ڕووح و یاسای ڕووناکییەوە.

کەواتە خودی مرۆڤ لە دوو ڕەگەز پێکهاتووە.

ڕەگەزی گیانی نوورانی و ڕەگەزی (نەفس) کە لە (نەفەس)وەرگـیراوە واتـە لـە ژیـان و لـە جەسـتەیەکی گڵـین کـە نوێنـەری ڕەگـەزی پێویـست و مـەیل و هەوەسە ژیانیە گڵینەکانـە، هـەر بۆیەشـە کـە (زُيِّـنَ لِلنَّـاسِ حُـبُّ الـشَّهَوَاتِ مِـنَ

النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ)(١٤) آل عمران و

پێویسته مرۆڤی خاوەن ڕووح گەشه به نەفسه حەیوانیەکه بکات:

(وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى)(٤٠) (فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى)(٤١) النازعات

له ڕاستیدا ئەگەر ئێمه له ژیانی و ئامانجی مرۆڤ قوولْ ببینەوە، دەبینین که ژیانی هەمیشه پەیوەست بووە به ململانێله نێوان ئەو بایەخ و بڕوایانەی مرۆڤ ڕوویان تێ دەکات و حەزی لییانەو جەستەی ماددی خاکی و ئارەزووەکانی و پێداویستیو پیسییەکانی ئەو داوای دەکەن، ئەگەر بێتو بایەخەکانی حەق و دادگەریی و جوانی فریای نەکەونتێن و بەرزیان نەکردبێتەوە.

خوای پەروەردگار لە کتێبە جێگیرەکەیدا، لە زۆر ئایەتدا سروشتی ئەم ململانییەی و ئامانج و مەبەست و بایەخ و یاساکانی بە جوانی ڕوونکردووەتەوە:

(الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ)(٢) الملك.

بەم شێوەیەی قورئان و شەریعەتی ڕووناکی ڕوونی دەکاتەوە که ژیانی ئەم دنیایەیمرۆڤ، زۆرانێکە لە نێوان ڕووح وبڕواو ماناو بایەخەکانی لە لایەك و ماددەو حەزو ئارەزووەکانی لی لایەکی تر، ئەم دوو ڕەوتە لە خودو بوونی مرۆڤدا، لە ژیانی دنیادا، بە شێوەیەکی دانسقه یەکدەگرنەوە، و ئەم یەکگرتنەوەیەش کۆتایی پێ دێت، یان بەرەو بەرزیی و پاکی و پاکژیی و بەهەشت و ژیانیکی نەبڕاوەی خۆشیدا، یان بەرەوە نغرۆ بوون و ستەم و

ناڕەوایی و خراپەکاری و ڕەنج بە فیڕۆ چوون و زیانمەندبوون و سزاو دۆزەخ و بەدبەختییەکی جێگیر.

(إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ)(١٣) (وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ)(١٤) الإنفطار.

واتە بە ڕاستی چاکە کاران لە بەهرەی بەهەشتی خودا جێگیرن، و خراپە کارانیش لە دۆزەخدان.

(يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ)(٢٧) (ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً) (٢٨) (فَادْخُلِي فِي عِبَادِي)(٢٩)(وَادْخُلِي جَنَّتِي)(٣٠) الفجر.

ئەی گیانی دڵنیا بگەڕیوە بۆ لای پەروەردگار خۆشنوو و رازی کراو، جا بچۆرە ناو بەندەکانمەوە و برۆ ناو بەهەشتی منەوە.

لە سایەی ئەم وێنەیەو ئەم زۆران و ململانییەی نێوان ڕووح و بڵندبوونەوەو ماددەو گڵ و نغرۆ بون و ئارەزووەکانی، کەسێك تێ بفکرێت، مانای ململانێی ماددی و مانای سووڕی ژیان و نیشانەکانی وەك دیمەنەکانی پەستی گڵ و خاك و جۆرەکانی ستەمکاریی و پەلامارو دەستدرێژی دەبینێت، هەروەها ئەنجامەکانی ئەم ململانێیە کە بریتین لو سیستەمە خاکی و دوژمنکارییە پەستەکانی جەنگەڵ دێنە بەرچاوی، ئەو ساتە وەختانەی لە ژیانی گیانلەبەراندا ولە ژیانی مرۆڤی گومڕادا لایەنی هێز بە سەر لایەنی ڕاستیدا زاڵ، ئەو مرۆڤەی دیمەنێکە لە دیمەنەکانی بوونی ماددی، و سروشتی بوونی ماددی پەست، دیسانەوە ئەو دژایەتیانەی لە ناخی مرۆڤدا هەن لە نێوان ڕووحی رووناك و حەیوانییەتی گڵین و ماددیدا، لە نێوان بەرزبوونەوەو گومڕاییدا، هەروا هۆگربوون بە زەوییەوە کە ئەنجامی گومڕاییە، هەموو ئەمانە دەبینێ، بە پێچەوانەی سۆز و تاسەکانی ڕووح و شەریعەتی رووناکی کە گیانی مرۆڤ بە پلەکانی ڕاستی و چەمکەکانی چاکەدا بەرز دەکاتەوە.

جا چۆن گەوهەری مادده بە سروشتە نزمەکەی بوونی خۆی، لە هەندێك ڕووەوە، تەفسیری هێما بوونی پاکژی ماددی و مەعنەوی دەکات لە ئیسلامدا، وێڕای ئەو مەبەستانەی لە ژیانی و هەڵسو کەوت و پەرستنی تاکدا هەن، وەکوو خۆ پاککردنەوەو دەست نوێژ و غوسڵ و پاکژی وستر و خۆ پۆشین و زیکرو بسمیلا لە کاتی نان خواردندا و تەکبیربە ناوی خوداوە لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا، نەکوشتن و ڕاونەکردنی ئەو گیاندارەی مرۆڤ پێویستی پێی نیە، ئاگاداریی گیانداری بە سەزمان و نەرمبوون لەگەڵی. وەکوو پاراستنی ژینگە، لە هەمان کاتدا لە هەندێك ڕووەوە تەفسیری کەراهەت و حەرامبوونی خواردنی هەندێك گیان لە بەری وشکانی دڕندە دەکات، کە لەم زەویەدا هاوبەشی مرۆڤن و ئامرازی ڕاو و پەلاماریان پێ دراوە، وەك کەڵبەو چنگ، چونکە خواردنی ئەم گیان لە بەرانە، مرۆڤ دڕندە دەکات و دەیخاتە ململانێ لەگەڵ هێزی حەیواناتدا، دوورتر لەوەی بۆ گوزەرانی پێویستە.

ڕێی تێدەچێت ئەگەر مرۆڤ دڕندەکانی خواردبا، واتە ئەو زیندەوەرانەی هاوبەشی مرۆڤن لە وشکانیدا، بوون و قەوارەو ژینگەی خاکی مرۆڤ لەگەڵیاندا بەردەوامە، ئەوا کاریگەرییان لە سەر هەڵس و کەوت و سروشتی مرۆڤانەی ئەو دادەنا.

کەئەمەش دەگونجێت مەبەستی ئەو حیکمەتە بێت کە دەڵێت:

(پێم بڵێ: چی دەخۆیت، تا پێت بڵێم تۆ کێیت؟).[1]

---

[1] - سەرنج ڕاکێشە بۆ زمانەوانەکانی زمانی عەرەبی کە خوا هەڵیبژاردووە بۆ ناردنەخوارەوەی دواهەمین پەیامی ئاسمانی قورئان پێی، کە جێی تێرامانە ومن سەرنجم داوە، کە ناوی ئەو جەمسەرانەی پەیوەندییان بە ملارۆڤەوە هەیە هەموو هاوسەروان واتە بە ئەلف ونوون کۆتاییان دێ بۆ نموونە:

خوادی ئەفرێنەر... الرحمان.

شەیتانی شەڕانی... شەیتان.

**وێـڕای ئـەو زەرەروو زیانـەی لـە خـواردنی گۆشـتدا هـەن وەك ئـەوەی لێکۆڵینەوە زانستیەکان ئاماژەی بۆ دەکەن.**

---

جیهانی نادیار وشاراوە لە بوونەوەردا... الجان.

زیندەور و ئاژەلی نزم... الحیوان.

ئادەمیزادی فەرامۆشکاری هەڵەکەر... الإنسان.

جێی سەرنجە کە فریشتەکان جەمسەرێکی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆی ئـەم پەیوەندییـە نـین، بـەڵکو جێبەجێکـەری فرمانی خودان (لایعصون الله ما أمرهم ویفعلون ما یؤمرون) التحـریم:٦، بۆیە ئەوان وەسفێکیان بەم سەروایە نییە، وەکوو ئەوەی جەمسەر و لایەنـەکانی تـری بوونـدا تێبینیمـان کـرد. دەتـوانین بگەڕێینـەوە بـۆ قورئـانی پـیرۆز و وردبیینەوە لەوەی سەبارەت بە زاتی ئیلاهی هاتووە: چۆن سـیفەتی بـەزەیی یەکەمینـە: بسم الله الـرحمن الـرحیم) (والهکم اله واحد لا اله الا هو الرحمن الرحیم) البقـرة ١٦٣. (قـل ادعـو الله او الـرحمن ایـاً مـا تـدعوا فلـه الأسمـاء الحسنی) الاسراء ١١٠، سەبارەت بە شەیتان و وەچەکانی و جیهانەکانی نادیار و زیندەوەران و مرۆڤیش ئەم سەرنجە راستە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئەم بوونەوەرانە لە زۆر ئایەتدا باس دەکا و روونیان دەکاتەوە.

خودا لە بارەیانەوە دەفەرموێ: (فإذا قرأـ القرآن فاستعذ بالله من الشیطان الرجیم) النحل ٩٨، (ومن یتبع خطـوات الـشیطان فإنـه یـأمر بالفحـشاء و المکنـر) النـور ٢١، (إن الـشیکان لکـم عـدو فاتخـذوة عـدواً) فـاطر٦، هـەروەها دەفەرموێ: (وما من دابة في الأرض ولا طائر یطیر بجناحیه الا امم امثالکم) الأنعام ٣٨، (اولئـك کالأنعـام بـل هـم أضل اولئك هم الغافلون) الأعراف ١٧٩، (والأنعام خلقها لکم فیها دف ء ومنافع ومنها تأکلون) النحل ٥، (ومـن الناس و الدواب والأنعام مختلف ألوانه) فاطر ٢٨، تێبینی دەکرێت کە وشەی حەیوان وەك وەسفێکی نـزم بـۆ ئـاژەڵ لەم قورئاندا نەهاتووە بەڵام باسی هەندێك جـۆری بەسـوودی کـراوە وەك (بهیمـة الأنعـام) و حـوت البحـر) یـاخود گرنگترین سیفەتی باسکراوە وەکوو خشان بەسەر زەوی و فڕین بە ئاسماندا.

خوای گەورە لە بارەی مرۆڤ و سیفەتی فەرامۆشییکردنیەوە دەفەرموێ: (استحوذ علیهم الشیطان فأنسیهم ذکر الله) المجادلة ١٩، (ولقد عهـدنا الی آدم مـن قبـل فنـسيَ ولم نجـد لـه عزمـا) طـه ١١٥، (اتـأمرون النـاس بـالبر وتنـسون أنفسکم) البقرة٤٤، (ربنا لاتؤاخذنا إن نسینا أو أخطأنا) البقـرة ٢٨٦، بەڵام خودا خـۆی پـاك و بێخەوشـە و هـیچ شتێك فەرامۆش ناکات (وماکان ربك نسیاً) مریم ٦٤.

## ماتریالیزم یاسای جەنگەڵ و ستەمگەرابیيه:

ئەم دەسپێکە، ناڕەوایی فەلسەفەی داروینیزمی کۆمەڵایەتی ڕووندەکاتەوە، ئەو فەلسەفەیەی لە ناوەڕۆکدا فەلسەفەیەکی ماددی بێ بڕوایە لە سەر گریمانەیەکی سادەی بێ بەڵگەی منداڵانە دامەزراوە، کە ئەویش بێ ئامانج بوونی جیهانە، ئەو فەلسەفەیەی کە مرۆڤ تەنها بە گیان لە بەرێك واتە گلێك دەبینێت کە بێ ئامانج دروستکراوە و کوێرکوێرانە وەکوو هەموو گیان لە بەران قۆناغ بە قۆناغ گەشەی کردووە، بۆیە لەم فەلسەفەیەدا ڕازی ئەفراندنی خودایی و ڕەهەندە ڕووحییەکەی جێگەی نابێتەوە و مرۆڤ هیچ ڕەهەندێکی ڕووحانی نیە کە لە دروستکراوەکانی تری سەرزەوی جیای بکاتەوە، بەو دەرك و ڕووح و ناخەی کە هەیەتی، بەو خێر خوازی و هەڵس و کەوتەوە، کە لە ئەفراندنی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤدا بوونی هەیە. لە ڕستیدا مانای ژیانی مرۆڤ لەم جیهانەدا بریتیە لە بەیەك گەیشتنی ڕووح و گڵ، و ململانێی نێوان ڕووح و مادده، نێوان چاکەو خراپە، نێوان ڕەواو و ناڕەوا و نێوان ڕووناکی و تاریکی[1]

---

٢ - ناڕەوایی لۆجیکی داروینیزمی کۆمەڵایەتی کوێر کوێرانەی بێ بڕوا بەو مانایە نیە، کە ئێمە ئەفراندنی قۆناغ بە قۆناغی مرۆڤ لە ڕووی مادديیەوە ڕەتبکەینەوە، ئەگەر ئەوە بە خواستی خودا بووبێ تا ئەو کاتەی بە جوانی سازاندوویەتی و گیانی بە بەردەماندووە، تەنانەت لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە هەیە بۆ ئەم گەشە کردن و قۆناغ بە قۆناغە، تا ئەو ساتەی کە مرۆڤ دەبێتە مرۆڤێکی تەواو. خودا دەفەرموێ: (الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ)(٧)(ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاء مَّهِينٍ)(٨) (ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَّا تَشْكُرُونَ)(٩) السجدة، روونە بەپێی راستەواتای ئەم ئایەتە و ئاماژەی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی زانستییانە کە خوا ئەفراندنی مرۆڤی بڕیارداوە بەسێ قۆناغ بێت : دوانیان قۆناغی زیندوەرین گیانی تیایە بەس رووحی نیە، قۆناغی ئەفراندنی سەرەتایی و قۆناغی گەشەسەندنی زیندەوەری زاووزیکردن، ئینجا قۆناغی سێیەمی کۆتایی کە خوا باوەئادەمی کردە مرۆڤێکی ساغ ودروست و لە رووحی خۆی پێیدا دەماند، کە ئەمەش بە بۆچوونی هیچ رەبتێکی بە بیردۆزەی کوێرکوێرانەیسادەی داروینیزمەوە نییە، خوا دەفەرموێ: أنما امره اذا اراد شيئاً ان يقول له كن فيكون * فسبحان الذي بيده ملكوت كل شيء واليه ترجعون (يس: ٨٢-٨٣)

فەلسەفەی داروینزمی کۆمەڵایەتی ئەو فەلسەفەیە کە هزری هاوچەرخی خۆرئاوای لەسەردەمەزراون دوای ئەوەی _ بە لێبوردنێکەوە _ پشتی کردە مەسیحیەتی دەسکاری کراو و ڕوانگەی ئەو بۆ مرۆڤ و ژیان و بوون. ئەم فەلسەفەیە لە پەرستنی ماددەو هێزدا بەرجەستە بوون و بڕوای بە زاڵ بوون و سەرکوتکردن و پەلاماردان هەیە، بێ گومان ئەویش بە مانای فەرامۆشکردنی ڕەهەندی ڕووحی مرۆڤ و پێشێل کردنی ڕاستی و دادگەریو ڕووناکی و بەرپرسیاریەتی مرۆڤە، واتە سەرشۆڕ کردنەوەی مرۆڤ و نزمبوونەوەی بۆ ئاستی گیان لە بەرانی پەست و ئاستی یاسای جەنگەڵ و ڕاوکردن، ئەو یاسای ماف بە زاڵ بوون مانا دەکات و دەیدات بە هێز و کەسێك شایستەی مانەوەیە کە چاکتر واتە بەهێزتر بێت، ئەم هزرەش لە خۆرئاواو چاولێگەرانی خۆرئاوادا بە تەواوی جێگیر بوون.

لە ڕاستیدا هەموو چەمکەکانی مرۆڤ دۆستی و بەزەیی و هاوپشتی و بڵندایەتی مرۆڤانە کە سەرووترن لە گیانی ناسیۆنالیزمی فاشیانە، بە شێوەی جۆراو جۆر لە سیاسەتەکانی پەیڕەوانی ئەم فەلسەفەیە و چەمکەکانیدا لە ناو دەچن، کاتێك مامەڵە لەگەڵ ئەویتر دەکەن، بە تایبەتی لە فۆرمی ئیمپریالیزم

---

واتەویستی خودا بەو شێوەیە دەڕوات کە خۆی دەیەوێت، واتە دەبێت ببێت، واتە مرۆڤ تەنها زیندەوەرێك نیە، بەڵکو ئافەریدەیەکە خاوەنی رووح، کە دەتوانێت بەو عەقڵ دەروون و دەرککردنەی کە هەیەتی ڕووەو رووناکی حەق بڕوات و دژ بە یاسای حەیوانیی جەنگەڵ بێت، بۆیە باسی زانستی هەرژی لەبارەی شێوەی ئەفراندنی مرۆڤ لە لایەن خواوە جێگیر بکات، لای بڕوادار وەردەگیرێت، چونکە ئەمە بەمانای فرمان و ویستی خودایە، بۆیە پێویستەمسوڵمان بە دوای زانست و مەعریفەدا بچێت، چونکە ئەم دوانە لە ئەنجامدا هیچ دژایەتییەکیان لە گەڵ ئەو سرووشەدا نیە کە خوای بەدیهێنەر ناردوویەتیە خوارەوە: (سنريهم آياتنا في الآفاق و في أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق) فصلت ٥٣، (قل سيروا في الأرض فانظروا كيف بدأ الخلق) العنكبوت ٢٠.

و داگیرکاریدا گیانی حەیوانیەت و توندوتیژی جێگەی ئەم چەمکانە دەگرێتەوە و قێزەونترین جۆری ڕەگەز پەرستی دوژمنکارانە و داگیکارانە زاڵ دەبێت، کە گەلانی مرۆڤایەتی لە سەردەستی خۆرئاوا جۆرەها ستەم و سەرکوت کردنیان لێ چەشتوون.

ئەم هزرە لە هەمان کاتدا گوزارشت لە سەر هەڵدانی ناسیۆنالیزم دەکات لە هزری سیاسی نوێی ئەورووپیدا، کە لە توندوتیژی و فاشیەتدا هەندێك جار گەشتووەتە ئاستی وەحشیگەریی، وەکوو ڕووداوەکانی ئەمریکای باکوور و باشوور و ئەفریقا و ئوستراليا و وڵاتانی خۆرهەڵاتی دوور، هەروەها ئەوەی ئەمڕۆ لە فەلەستین دا ڕوودەدات، لەلایەنی خۆرئاوای زایۆنییەوە.

یاسای جەنگەڵ هەمان یاسای گڵ و یاسای ڕاوکردن و یاسای ستەم و یاسای ڕەگەزپەرستی و یاسای دەستدرێژییە. بەڵام یاسای ڕووناکی ئەوەی کە پەیامە ئاسمانییەکان هێناویانە، چ ئیسلام و چ پاشماوە دەستکاری نەکراوەکانی ناو ئاینەکانی دیکە، بریتییە لە یاسای بەرپرسیارێتی و یاسای برایەتی و هاوسۆزی و هاوپشتیی مرۆڤانە، بریتییە لە یاسای خۆپارێزی و گیانپارێزی، لە یاسای دانەوەی ئەمانەت و پشتگیریی لە ستەملێکراوان و یاسای زیادەڕەوی وخراپەنەکردن، بەڕوانگەیەکی مرۆڤانە، نەك خۆپەرستانە یان ناسیۆنالیستانە یان فاشیستانە.

لەم شەریعەتەدا هێز هی ڕاستییە و ڕاستی هێزە، بە پێچەوانەی یاسای جەنگەڵ، کە ڕاستی هی هێزە و هێز ڕاستییە. بە پێی یاسای جەنگەڵ لە پەیوەندیی گەلاندا هیچ بوارێك بۆ گفتەکانی ڕاستی و دادگەریی نامێنێتەوە، بەڵکو مافەکان و دەسکەوتەکان (لە ژێر ناوی بەرژەوەندی نەتەوەیی و

پێداویستیی سیاسیدا) لە سەر بنەمای زاڵبوون و بەپێی چارەسەری کێشە سیاسییەکان کە هێز و دەسەڵات دیاریدەکەن، ڕێکدەخرێن و دابەشدەبن.

ئەوەی گەلان دیویانە و هەمیشە دەیبینن بە دەست ئیمپریالیزمەوە، بە تایبەت لە ئەفەریقا و ئەمەریکا و نیوسەدە لە مەینەتی و ئازار چەشتن و کوشتار و ئاوارەیی و داگیرکرانی گەل و خاکی فەلەستین بە پشتیوانیی چەك وسیاسەتی خۆرئاوای داگیر کەر و بەدستی وەحشیگەریی زایۆنیستەکان، هەموو ئەمانە سەرەڕای درۆ و چەواشەکاریی سیاسی و ئیعلامی و جەنگی دەروونی زۆر وزەبەند، تێکڕا بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن لە سەر بەهاکانی یاسای جەنگەڵی خۆرئاوا، ئەو یاسا ماددی و خاکییەی کە چەمکەکانی لەسەر پایەی ستەمگەریی و دەستدرێژی و بانێك و دووهەوا و چەند هەوا دامەزراون. یاسایەك کە تا ئەمڕۆش زۆر نەهامەتی و ڕەنج و بەڵای بۆ مرۆڤایەتی پێوەبووە و پێوەیە، بە پێی ئەو هەموو چەك و جەنگ و کوشتارە بە کۆمەڵەی کە بەرهەمی هێناوە، بە پێچەوانەی پێوەرەکانی یاسای ڕووناکی و ئەو مەبەست و بنەمایانەی کە پەیامە ئاسمانییەکان هێناویانە، سەبارەت بە ڕاستی و دادگەری و سۆز و هاوپشتی یەکتری.

ئەو پەندەی لەم سەرنجانە وەردەگیرێت ئەمەیە کە لەمرۆڤدا هەروەکوو گەورەیی ڕووح و دەروون بەیەکدەگەن، مومکینە نزمایی و پەستی هەواو هەوەس و ئارەزووش کۆببنەوە، لە لایەکەوە ڕووح بەرەو راستی و دادگەریی هانیدەدات و لە لایەکی ترەوە حەیوانبوون و خاکبوون بەرەو ئارەزووات و هەواو هەوەس و ستەم و دەستدرێژی دەیجوولێنن، بێگومان هەر جەمسەرێك لەم دوانەش یاساو ڕێسای خۆی هەیە.

له جەمسەری ڕووح وڕووناكیی خواییدا یاسایەك هەیە كە هێز دەدات بە ڕاستی و بانگەواز بۆ چاكەو دادگەریی دەكات. بەڵام یاسای خاك و گڵ كە بە مانای حەیوانییەت و ژیانی ناو جەنگەڵ و دەستدرێژییە، هەموو مافێك دەدات بە هێز، بۆیە مرۆڤی ناو ئەم یاسا ماددییە و ناو ئەم جەنگەڵە فێری زۆرەملێ و دەستوەشاندن و ستەم بووە و دەبێت.

## ڕاستی لای هێزە:

## یاسای خۆرئاوای ماددی و فاشی و داگیركەر:

له بەر ئەمە كاتێك خۆرئاوا وازی له یاسای ڕووناكی هێنا و تێكیدا و پشتی تێكرد و بە تەواوی ڕووی لە زەوی كرد، ئەوسا گومڕایی باڵی كێشابەسەر هزریدا و لە ئەنجامدا ڕووی وەرگێڕا لە لایەنی رووح، بە هاوئامانجەكانی و بەرگی حیوانبوونی پەستی ونزمی له بەركرد وگەڕایەوە بۆ تاریكایی نەفامی، واتە یاساكەی ببوو بە یاسای جەنگەڵ، یاسای حەیوانییەت و دەستدرێژی و فاشیزم و ئیمپریالیزم، ئەو یاسای كە هەممو مافێك دەدات بە هێز. لێرەوە، لەم بەهاو بایەخە حەیوانیەوە _ له كۆمەڵگاكانی خۆرئاوا _ ڕەوشت و هەڵس و كەوتی ڕەوشتیانە هەموو ڕووخان، جگە لە چەند پاشماوەو بەرماوەیەكی ڕووح و یاساكانی ڕووناكی و ئەو داب ونەریتە كزو كەمڕەاگانەی له مەسیحیەتی بەرایی بۆیان مابۆوە یان له پێشینەی پەیوەندی و دەرسخوێندنیان لە سەر دەستی كۆمەڵگاو ژیاری ئیسلامی له سەدەكانی ناوەڕاستدا فێری بووبوون.

له ئەنجامدا توندو تیژی و ڕەگەز پەرستی و خراپە كاری بڵاو بووبەوە و زۆربەی پایەكانی خێزان ڕووخان، خێزان لەوە دەرچوو لانكێك بێت بۆ

منداڵبوون و سۆز و هاوسۆزی، بەڵكو بوو بە تەنها هەڵپەیەك و چەند چێژێكی سێكسی سەركێشانە ئەرك و بارێكی قورس بە سەر باوكانەوە، كە ڕایان دەكرد لێی، بۆیە مافەكان فەوتان و ڕنج و مەینەتی دایكان و منداڵكانیان زیادی كرد، لە بواری نێو دەوڵەتیشدا هیچ پێگەیەك بۆ پێوەرەكانی ماف و دادگەری نەما، لە پەیوەندییەكانی خۆرئاوا و گەلانی تردا. بەڵكو هێز بووە تاقانە پێوەر، ئەو هێزەی بە زۆری زۆرداری و فێڵو چەواشەكاری، واقعی ناڕەوا دەسەپێنێ، ئەویش نەك بەپێی هێزی ڕاستی و ماف، بە ناوی بانگێشەكانی سیاسەت و ڕێگا چارەی میانە ڕەوانەو واقیع بینییە و بەرژەوەندی ناسیۆنالستییەوە. كە هەموو ئەمانی لۆجیكی هێز فەرزیان دەكات.

بە پێی ئەم لۆجیكە ستەمگەری دەبێتە سیاسەت و لێزانی، بێ بەندو باری و ڕۆ چوون دەبێتە ئازادی و پێشكەوتن و شارستانیەتی.

واتە لەم بیرو فەلسەفەیەدا، لە ڕاستیدا، هیچ پێگەیەك بۆ ڕاستی و دادگەری نییە، چونكە ڕێنمای یاسای جەنگەڵ و ئامانجەكانیش بریتییە لە هێزو بەرژەوەندی ناسیۆنالیستی و چاو چنۆكی خۆپەرستانە.

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەم نەفامە دڕندانەی باسكردووە، كە پەیڕەوی لە یاسایجەنگەڵ دەكەن. كە لەم سەردەمەدا لەو كردەوە داگیركەرانە بەرجەستە بووە كە گەلانی خۆرئاوا دژ بە گەلانی ئاسیاو ئەفریقا و هەردوو ئەمریكا بە شێوەیەكی نامرۆڤانە ئەنجامیان داوا. هەر ئەوەشە تا ئەمڕۆ دەبینین لە سیاسەت و ڕەفتاری خۆرئاوا دژ بەم گەلانە. بە تایبەت بە درێژایی سێ چارەكە سەدەیەك كردەوەی داگیركەرانە و دڕندانەی نیشتە جێ كردن، كە زایۆنیزمی ڕەگەست پەرست بە پشتیوانی و دنەدانی مەسیحیەتی خۆرئاوای زایۆنی پەرست دژ بە گەلی فەلەستین ئەنجامی دەدات، كە بە

شێوەیەکی فاشیانەو دڕندانە دەیەوێت ئەم گەلـە قەڵاچـۆ بکـات، لـە ئەنجامـدا سەدان هەزاری لێ کوشتوون و ملیۆنەهای لێ ئـاوارە کـردوون و چـوار بـەش لـە پێـنج بەشـی زەویـەی لێ زەوت کـردوون، ئەمڕۆشـی لـە سـەر بێـت خـاك و خەڵکەکەشی لە ناو بردوون، تاکو ئێستاش بە شێوەیەکی دڕندانـەی بـێ هاوتـا لە کوشتارو تێکدانی ژیان و دەرکردنی ئەوانی دیکەی داون بە جۆرەهـا ڕێگـەی خوێناوی بەردەوامە، بە بێ ئەوەی هیچ ڕەچاوێکی بایەخە مرۆییـەکان یـاخود پەیمان و یاسا نێو دەوڵەتیەکان یان مافێك لە مافەکانی مرۆڤ بکات، کـە ئـەمڕۆ بووەتــە چــەند وشــەیەکی ڕاســت و بــە مەبەســتی نــاڕەوایی سیاســەتەکانی خۆرئــاوایی زایــۆنی و ئیمپریالیــستی بــەکار دێــت و بووەتــە ئامرازێــك لــە ئامرازەکانی و بە بۆ چوونی ئێمـە تـەنها لـەو بارانـەدا ڕێزیـان لێ دەگیرێـت کـە پەیوەندی بـە بـاری ڕەگـەزی خۆرئـاوایی و ئـامرازە زایۆنەکـەی و هاوولاتیـانی خۆیانــەوە هــەبێت و بەرژەوەنــدی داگیرکەرانــە و ســتەمگەرانە و دڕندانــە و نیشتەجێ کردن (ئیستیتانییە) کانی پێ دابین بکرێت.

خـوای پــەروەردگار لـە باسـی نەفامـەکانی دواکـەوتوی یاسـای جەنگەڵدا، ئەوانەی لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا و ئەوانەش کە دواتر هاتوون و لە سەر هەمان پەیڕەوە پڕۆگرام بوون، لە سورەتی تەوبەدا دەفەرموێت :

(كَيْـفَ وَإِن يَظْهَـرُوا عَلَـيْكُمْ لاَ يَرْقُبُـواْ فِـيكُمْ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّـةً يُرْضُـونَكُم بِـأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَى قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ)(٨) التوبة.

لە هەمان کاتدا نابێت لە یادمان بچێت، کـە ئەمـە هەڵسەنگاندنی کـەلتوورو هزرو ژیـاری بـالا دەسـتو ڕەوتـی گـشتی خۆرئاوایـە لـە سـەردەمی نوێـدا، کـە سیاسەت و ڕەوتە رەگەز پەرستی و ئیمپریالیستیەکەی دەست نیـشان دەکـات وپاساو بۆ زۆرداریی دەهێنێتەوە و بێ پەروا قەبووڵی دەکـات و بـێ باکانـە بـە

بانێك و دوو هەوا ڕەفتار دەنوێنیٚ، نەوەك بمانەوێت تاك و گرووپە جیاوازەكـان هەڵبـسەنگێنین، كـە ڕەوت و بـیرو بـڕوا بـە شـێوەیەكی هەنـدەكی بـا گـشتی بەرامبــەر ڕەوتــی دڕندانــەیا ئیمپریــالیزم و زایــۆنیزم و لــە كۆمــەڵگادا دژ دەوەستنەوە.

ئەم ڕەوتانـە بـە داخـەوە تابـە ئـەمڕۆ ــ هـەر چـەند زۆر جیـاوازن، هێـشتا ئەوەندە گەورەوە كاریگەر نین كـە ڕەوتـی گـشتی زاڵـی كۆمـەڵگا و سیاسـەتی دەزگاكانی بگۆرن، ئەگەر چی هەندێك لەم تاك و ڕەوتانـە هەنووكـە پەیەوسـتن بە تروسكاییيەك لە بایەخەكانی ڕووناكی و هاندەرەكانی ڕووحەوە، كـە ڕەنگـە لە ئایندەدە ــ خوا یاربێت ــ ببنە تـۆی ڕیفـۆرم و هیدایـەت و خێرخـوازی لـەو كۆمەڵگایانــەدا و پیچویــستە هاوكــاریو پــشتگیری یــان بكــەین بــۆ چــاكەی وڵاتەكانیان و هەموو مرۆڤایەتی بە بیٚ جیاوازی.

لــە ڕاســتیدا مەحاڵــە لــە عەقلیــەتی هاوچــەرخی خۆرئــاوا و سیاســەتە پراگماتیـەكانی حـاڵی بـبین، كـە بەسـەرگەلانی لاوازدا خـۆی سـەپاندووە و بـە خاتری بەرژەوەندی خۆ پەرستانەیان بە زیاد لە پێوەرێك دەپێـون، وەك چـۆن ناتوانین لە هۆی راستەقینەی گەشە سەندن و برەوی بیرۆكەی ناسیۆنالیزم تـیٚ بگەین، كە ئەمیش بۆ خۆی ڕوویـەكی دیكـەی گەلـە كۆمـەی ڕەگـەز پەرسـتیو دڕندایەتییەو لە خاڵی هێزو زاڵبـوون و بـە نێـچیر كردنـی ئـەوی تـرەوە دەسـت پێدەكات، بە تایبەت لەم قۆناغەی ئێستای مێژووی خۆرئاوادا، كە ناسـیۆنلیزم دیاردترین سیمای ئایدۆلۆژیایەتی، بـەو ئەنـدازەی كـە ناشـتوانین لـە زاڵبـوونی بیرۆكەی سیاسەتی هێز) Power Politics(و هـەژموونی سـوڵتە گەرانـەی ئیمپریــالیزم شــارەزا بــبین، ئــەو هەژموونــەی بیروبــڕوا دەبەســتێتەوە بــە دەستكەوت و قازانج ــ واتە بەرژەوەندی ــ ولە بواری پەلاماری نێـو دوەڵـەتی

هاوچەرخدا بە بەرژەوەندی میللی پێناسە دەکرێت، لـە هـەمان کاتـدا مـومکین نیە لەوە تێبگەین بۆچی خۆرئاوا ئەوەندە بە هەڵپیە بۆ خـۆ پـڕ چـەك کـردن و قۆنتەراتی چەك و پەرە پێدانی چەکی بە کۆمەڵ کوژ و سـەپاندنی سیاسـەت و بەرژەوەنـدی سـتەمگەرانەی خـۆی و ڕێ گـرتن لـە گەشـەی گـەلان و بگـرە هەوڵـدانی بـۆ لـە نـاوبردنی هەنـدێکیان و دەرکردنـی ئەوانـەی دەمێننـەوە لـە نیـــشتمانی خۆیـــان و بۆچـــی کاردەکـــات بـــۆ تـــالآنکرن و زەوت کردنـــی سەرچاوەکانیان و بۆ ڕێگرتن لە ڕزگاری ئابووری و کەلتووریيان، هەموو ئەمانە قابیلی تێگەیشتن نین ئەگەر بێتوو لەوە تێنەگـەین کـە خۆرئـاوا دەسـتبەرداری یاساکانی یاساکانی ڕووناکیی ئاسمان بووە، ئەو یاسایانەی لە ئاینی خۆرئـاوادا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و لـە بنەڕەتـدا– پـێش گۆڕانکـاری– هـەموو هێزێـك دەدەن بـە ڕاسـتی و بەرژەوەنـدی و دەسـکەوت بـە بـیر و بـڕوا دەپێـون، بـە پێچەوانەی یاسای ڕاوکردنی جەنگەڵ، کە هەموو مافێك دەدات بە هێـز و بـیر و بـڕوا بـە ڕبـەی دەسـکەوت و قـازانج دەپێوێـت و لـە ئەنجامـدا خـاك و گـڵ و بۆچوونەکانی زاڵدەبن بەسەر شکۆی ڕووناکی و تاسەکانی ڕووحدا.

جا بۆ ئەوەی لـە هـەموو ئـەو بابەتـە ئاڵۆزانـەی بـیر و ڕەفتـاری خۆرئـاوا و مـسوڵمانانیش تێبگـەین، پێویـستە لـە یاسـاو بەرنامـەی پـەیڕەوکراوی هـەموو گرووپێك حاڵیی ببین و بزانین چ ڕەوتێکی بڕوایی و چەمکییان هەیە !

ڕۆچوونی خۆرئاوا لـە ماددیگـەری چلێـسییە ماددییەکـە و بـە ئامانجـدانانی ماددە بە شێوەیەك کە هەڵپەی بۆ دەکات و نوقمبوونی خۆرئاوا لـەو ڕەهەنـدی بەکارهێنانەدا کە تێربوونی بۆ نیـە، بێگومـان بـە ڕەچـاوکردنی بنـەمای ئـاینی مەسـیحییەت ڕاڤــە ناکرێـت. بــەڵام بــە تێگەیـشتنی بنــەمای حەیوانییــەت و خاکیبوون قابیلی لێحاڵیبوونە. ئەمـەش ئەگـەر بـیر بکەینـەوە لـەوەی خۆرئـاوا

بەخاتری هۆکارگەلێك وازی لە ڕووحانییەتی خۆی هێنا، کە لە هەندێك ڕووەوە بەستراوە بەو تێکدان و دەستکارییەی کە زووتر تووشی پەیامی ڕووناکی مەسیحییەت و یەهوودییەت بووبوو. هەربۆیە خۆرئاوا بە گشتی یاسای جەنگەڵ و سروشتی ڕۆچوون و دڕندەیی پۆشی، واتە مادده و گوزەران بوونە ئەوپەڕی ئامانجی هەوڵ و کۆشش و بوونی گیانلەبەر، واتە ئامانج ومەبەستێك نامێنێت جگە لەم دوانە و هیچ تێکۆشانێك ناکات بۆ ئەم دوانە نەبێت، سەرەنجام لە خۆرئاوادا یاسای ڕووناکی نەما، ڕەوشت ڕۆچوو، بەهاو بایەخەکان ڕووخان و خراپەکاری پەرەیسەند و پێداویستی ژیانی ماددی وحەیوانی بوو بە ئامانج و هیچ ئامانجێکی تری لە دواوە نەما.

ئیتر زۆر سروشتی بوو – کاتێك خۆرئاوا وازی لە یاساکانی ڕووناکی هێنا و وەکوو گیانلەبەر بۆ مرۆڤی ڕوانی – کە مادده و ئاتاجەکانی ژیان و گوزەران ببێتە ئامانجی بوونی مرۆڤی خۆرئاوایی، بە جۆرێك کە هیچ ئامانجێکی تری نەبێت.

قورئانی پیرۆز دۆخی ئەم ئاکام و سروشت و ئامانج و چارەنووسەیان بەم شێوەیە ڕووندەکاتەوە:

وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ(١٢)محمد

أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ(١٧٩) الأعراف.

## دڵڕەقیی ئیمپریالیزم و فاشیزم و زایۆنیزم:

## بەیەکگەیشتنی شەیتان و حەیوان

سێیەم قاچی سێکوچکە و گەورەترین بەڵا ئەو ساتە وەختە دەست پێدەکات کە ئاگر و گڵ، واتە شەیتان و حەیوان لە مرۆڤدا بەیەکدەگەن، ئەوسا شەڕ و خراپەکاریی لە خراپترین وێنەدا بەرجەستە دەبن، و ستەم و دارمان و دوژمنایەتی بە ڕادەیەك زۆر دەبن کە مرۆڤە ئاساییە راستەکان ناتوانن تەنانەت بەشێك لە کردەوەی مرۆڤە خراپەکان بە خەیاڵدا بهێنن، ئەوانەی کە حەیوانبوونی خۆیانیان خستووەتە خزمەتی شەیتان و وزە وێرانکارییەکانیەوە، وەك خراپە و چەپەڵی و جۆرەکانی توندوتیژی و دڵڕەقی و پەستی ستەم و دوژمنکاریی دەرهەق بە بێتاوان و لاوازەکان.

ئەم پێکگەشتنەی ئاگر و گڵ، شەیتان و حەیوانەیە، لە هەندێك کەس و هەندێك لە گەلاندا، لەراستی و لە میژووشدا بوونی کەسایەتی تاوانکار و وێرانکەری وەك نیرۆن و چەنگیز و ئیڤانی تۆقێنەر و هیتلەر و ستالین، هەروەها وڵاتانی شەڕخوازی وەك ڕۆم و مەغۆل و ئیسپانیای سەدەکانی ناوەڕاست (لە ئەندەلوس) و ئیمپریالیزمی ئەورووپی لە ئاسیا و ئوسترالیا و هەردوو کیشوەری ئەمەریکامان بۆ مانا دەکات، کە بە ناڕەوا و بەدەستدرێژی چەندین نەتەوەو گەل و ژیاریان لەناوبرد وتا ئاستی نەهێشتن هێندێکیان کۆتایی پێهێنا ئێمە ئێستاشی بەسەرەوە بێت، کارە زشتەکانی هیتلەر و مۆسۆلینی و ستالین و ترۆومانمان لە بیرە کە لە ئەورووپا و ئاسیا و ئەفەریقا چیان نەکرد؟ لە هەمووی تفت و تاڵتر ئەوەیە کە هەنووکە دەیبینین و دەیبیستین کە گەلی فەلەستین بە چەك و پارەو پشتیوانی و پارێزگاریی

خۆرئاوا، به دەستی زایۆنیزمی خۆرئاواییەوە، به دەستی داگیرکەرانی نوێوە، چی بەسەردێ؟ خاك و نیشتمانی زەوت و وێرانکراوە و خۆیشی دەکوژرێ و بە ئەملاولای دنیادا ئاوارە دەکرێت، دنیاش دەیبنێت و دەیبیسێت، بەڵام هێزەکانی سەرکەش و داپڵۆسێنەری ئیمپریالیزمی جیهانی هاوچەرخ سەرکوتیان کردوون. لە هەمان کاتدا هەر ئەم بەیەکگەیشتنەی ئاگری وێرانکەر و گڵی نزم و پەستە، واتە شەیتان و حەیوانەیە کەلەم ژیارە ماددییەدا پەردە رادەماڵێت لە سەر رادەی شەیدابوون و گرنگیدان بە چەکەمەنی جەنگ و لەناوبردنی بە کۆمەڵ، هەر لە داهێنان و دروستکردن و کۆکردنەوە و دەستبەسەرداگرتنەوە بگرە تا بەرەودان بە بازرگانی پێکردن و بەکارهێنانی بێبەزەییانە و بێسڵکردنەوە، دژ بە مەزڵوومان و بویستانی داد و ئازادیخوازان و ڕزگاریخوازان لە دەستی زوڵم و ڕەتاندنەوە و ئیمپریالیزم.

وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِيَ آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ(١٧٥) وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَـكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ذَّلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ(١٧٦) سَاء مَثَلاً الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُواْ يَظْلِمُونَ(١٧٧) مَن يَهْدِ اللّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي وَمَن يُضْلِلْ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ(١٧٨) الأعراف.

أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً(٤٣) أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً(٤٤) فرقان.

إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ(١٢) وَكَأَيِّن مِّن

قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَاهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ(١٣) أَفَمَن كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِ كَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءهُمْ(١٤) محمد.

بَلِ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَهْوَاءهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ فَمَن يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ(٢٩) فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ(٣٠) الروم.

يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ(٧) أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاء رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ(٨) أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ(٩) ثُمَّ كَانَ عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا السُّوأَى أَن كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَكَانُوا بِهَا يَسْتَهْزِئُون(١٠) اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ(١١) وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ(١٢) الروم.

مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ(٢٠) الشورى.

وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُواْ إِثْماً وَلَهْمُ عَذَابٌ مُّهِينٌ(١٧٨) آل عمران.

وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا لَعَجَّلَ لَهُمُ الْعَذَابَ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا مِن دُونِهِ مَوْئِلاً(٥٨) وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِداً(٥٩) الكهف.

قُلْ مَن كَانَ فِي الضَّلَالَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَنُ مَدّاً حَتَّى إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّا السَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَاناً وَأَضْعَفُ جُنداً(٧٥) مريم.

وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ(٢٣) نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ(٢٤) لقمان.

قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ(١٦) ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ(١٧) قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْؤُوماً مَّدْحُوراً لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ(١٨) وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلاَ مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ(١٩) فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَاتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ(٢٠) وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ(٢١) فَدَلاَّهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَآنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ(٢٢) قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ(٢٣) قَالَ اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ(٢٤) قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ(٢٥) يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاساً يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشاً وَلِبَاسُ التَّقْوَىَ ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ(٢٦) يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ(٢٧) وَإِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءنَا وَاللّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء أَتَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٢٨) الأعراف.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَداً وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ(٢١) النور.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ(٢١) لقمان.

وَلأُضِلَّنَّهُمْ وَلأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الأَنْعَامِ وَلآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللّهِ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيّاً مِّن دُونِ اللّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَاناً مُّبِيناً(١١٩) يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً(١٢٠) أُوْلَـئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلاَ يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصاً(١٢١) النساء.

فَلَوْلا إِذْ جَاءهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَـكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ(٤٣) فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ(٤٤) الأنعام.

وَالَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ رِئَـاء النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَن يَكُنِ الشَّيْطَانُ لَهُ قَرِيناً فَسَاء قِرِيناً(٣٨) النساء.

اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ(١٩) المجادلة.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ(٢٠٨) البقرة.

## یاسای ڕووح یاسای ڕووناكی و دادگەرییە:

بەڵام مسوڵمانان ئەوانەی هێشتا پەیوەستن بە یاسای ڕووناكی و بە پەیامی ئیسلامەوە كە قورئانی پیرۆز پاراستوویەتی و تا كو ئێستاش جێگیر و نەگۆڕە

له دڵیاندا و له ناخەوه هیواخوازن که بتوانن خۆیـانی پێبڕازێننـەوە، ئـەمانیش گیانیان لەنێوان دوو پـشکدا دابەشـبووه، یـان بـژین بـەپێی ئـەو بایـەخ و بـڕوا بەرزانەی لـه نـاخ و دەروونیاندایـه و هانیـان دەدەن بـۆ ئـەوەی مـادده بکەنـه ئامرازێك بۆ ئامانجێکی شکۆمەند و گەورەی وەك تێکۆشان به راسـتی و بـه داد و بەرجەسـتەکردنی لـه بـاری ژیانـدا و بـەکارهێنانی ژیـان و گـڵ و مـادده بـۆ بەدەسـتهێنانی چـەمکەکانی ڕوونـاکی و بـەها و ئامـانج و مەبەسـته ڕووحییـه بڵندەکانی و پراکتیزەکردنیان، بۆ ئـەوەی مرۆڤـەکان بـه خـودیی خۆیـان و بـه ماددەش باڵابکەن، واته مادده بکەنه ئامرازێکی ڕووناك و بەسـوود، یـاخودوەك شکڵ و شێوەی خۆرئاواو چەمکەکانی ڕووبکەنه ئەوەی ئارەزووی دەکەن، وەك گوزەرانێکی ماددی خۆش و به چێژ و ئاسـان، کـه جەسـتەی خـاکیی و حـەزه حەیوانییەکانی دەیانخوازێ و ڕوویان تێدەکات. ئەمانه لـه بـەر ئـەوەی لەسـەر دەستپێك و ئامانجی ئاینەکـەیان سـەبارەت بـه مـادده بۆچـوونێکی تـەماوییان هەیه و نـازانن مـادده بـۆ خـۆی ئـامرازه یـان ئامـانج؟ کاتێـك بوونـه شـاگردی خۆرئـاوا شـاگردگەلێکی شکـستخواردووی بـێئیراده و بـێ بڕیـار بـوون، بـه پێچەوانەی گـەلانی تـر کـه دوای ئـەمان ببونـه شـاگردی خۆرئـاوا، بـۆ نموونـه ژاپۆن. هەربۆیه تـاکوو ئـەمڕۆ هـەموو کۆشـشێکی مـسوڵمانان بـۆ پیـشکەوتنی تەکنۆلۆژی شکستی هێنـاوه ووزه و بڕیارەشـاراوەی گـەلانی مـسوڵمان تـا بـه ئێـستاش وەڵامـی نەداوەتـەوه و نـەبزووتووه.چـونکه پـێش ئەمـه پێویـسته دیدگای ئەم گەلانه لەسەر مادده ڕۆشن بێت و له ئیسلامەوه هـەڵبقوڵێت، واتـه بـزانن کـه مـادده ئـامرازێکی پێویـسته بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامانجـه ڕووحییەبەرزەکان، ئەڵبەته له ڕێگای مادده و بوون و ژیان و گوزەرانەوه.

کەواتە ئەگەر ئێمە لە خۆمان و دەستپێکی بیرکردنەوە و لە بنیاتی ناخی خۆمان تێبگەین و لەو چەمك و بنەمايانەش حاڵیی ببین کە ویژدانمان دەجووڵێنن، ئەو لەوەش تێدەگەین کە دەروونی مسوڵمان قەت رازینابێت بەوەی کە مادده و پێداویستی گوزەرانی بکاتە ئامانج بۆ خۆی. هەر بۆیە دەبینین هەر چەندە مسوڵمان تەم ومژ لەسەر بڕواو هزری هەبێ و لە هەوڵو تەلاش و پەیوەست بوونی بەماددەو پێویستییەکانی گوزەرانیەوە چاولێکەری خۆرئاوا بکات و بیکاتە ئامانج، بەڵام هێشتاکوو لە بەر ئەوەی لە ناخەوە مسوڵمانە هەرگیز بەوە قایل نابێت کە مادده تاکە ئامانج بێت و هەرگیز ڕێ ناکەوێت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان نەتەوەی ئیسلام مادده بمەنە ئامانجی ژیان ــ باوەکوو مادده پێویستیش بێت بۆ ژیان و گوزەران ــ، چونکە لە بڕواو دەروون و مەبەستی بوونی مسوڵماندا مادده قەت نەبوەتە بنەما. لەبەر ئەمەشە مسوڵمان بەردەوام لە پێڕەوکردن و چاولێکردنی خۆرئاوادا، کەسێکی شل و شۆڵ و ڕاڕایە، کە ئەمە بووەتە هۆی شکستی هەوڵەکانی بۆ ڕابوون و بۆ یەرهەمهێنان و داهێنان و لەمەولاش بەردەوام هەر شکستدەهێنێت، چونکەبەبێ ڕوانگەیەکی ڕۆشن و ئامانجێکی دیاریکراو نەهێز بوونی دەبێ و نە بڕیار.لێرەوە ئاشکرایە ئەگەر مسوڵمان بە تەمای ڕابوون و هەڵگرتنی پەیام بێت، پێویستە لە مامەڵەکردنی مادده و بەکارگرتنی ئامرازەکانیدا جیددیتر بێت بۆ ئەوەی بەهاو ئامانجە جوانەکان بەدەستبهێنێت و لە گەشتی ژیاندا بەرجەستەیان بکات، بە بەڵگەی ئەوەی بەبێ مادده، نە بەدەستهێنانی ئامانجەکان مومکین دەبێت و نە ئەو مەبەست و بەهایانەش بەرجەستە دەبن، هەرکاتێکیش کە مادده ماناکانی چاکە و راستی و جوانی و یاسای ڕووناکیی بەرجەستەکرد ئەوسا بۆ خۆی بەرزدەبێ و دەبێتە خێرو بەهرە و سەربەرزی و

پێشکەوتن، بەڵام ئەگەر مادده بۆ خۆی بووە ئامانج و ئامانجەکانی یاسای جەنگەڵ و ستەم و دوژمنایەتی و ڕەگەزپەرستی و شیرك و بێباوەڕی بەرجەستەکرد، ئەوسا بەڕاستی دەبێتە ستەم و شەڕ و خراپەکاریی لەسەرزەویدا و دەبێتە فێڵ و تراویلکەو حەز و ئارەزوو.خوای گەورە دەفەرموێ: وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُواْ الْخَيْرَاتِ(١٤٨) البقرة.

وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْراً لَّهُمْ (٦٦) النساء.

اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْراً وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ(١٣) سبأ.

كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ(٣) الصف.

وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ(٧٧) القصص.

وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ (٢٠) المزمل.

وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ(٢١٥) البقرة.

يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَراً(٣٠) آل عمران.

وَزِنُواْ بِالقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَلِكَ خَيْرٌ (٣٥) الإسراء.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ (١٧٢) البقرة

فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ حَلالاً طَيِّباً وَاشْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ (١١٤) النحل.

قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِي لِلَّذِينَ آمَنُواْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ(٣٢) قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللّهِ (٣٣) الأعراف.

أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءهَا وَمَرْعَاهَا(٣١) وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا(٣٢)متاعاً لَكُم و لأنْعامِكُمْ (٣٣) النازعات.

وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ(٣٢) وَسَخَّر لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَآئِبَينَ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ(٣٣) إبراهيم.

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً (٢٠) لقمان.

وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ(٢٦) الأنفال.

ليأكلوا من ثمره و ماعملته أيديهم أفلا يشكرون (٢٦) يس.

يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ(٣١) الأعراف.

كەواتــە ئەگــەر مــسولْمان ویــستی لــە كێبركێــی شارســتانێتی گەلانــدا پێشبكەوێت ئەوا پێویستە بنەما بڕواییەكانی خۆی بەبێ تەم و مـژ بزانـێ و بـە جۆرێك مامەڵە لە گەڵ مادده و ئاتاجەكانی گوزەراندا بكات كە بیكاتە ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە ڕووحییە هەتاهەتاییە گەورەكانی، لـە دروسـتكردنی ژیاری ڕاستی و بەرجەستەكردنی كۆمـەڵی هاریكـاری و دادگـەری و گـەورەیی و هاوپشتیی مرۆڤانەی راست، ئەگینا ناتوانێـت ژیـان بـە شـێوەیەكی جیددییانـە وەربگرێـت و نابێتــەجێگرێكی چاكـساز و داهێنــەر و لــەم كێبركـێ جیهانییــەدا سەركەوتوو نابێ و توانای دامەزراندنی ژیاری راستەقینە و جێگیركردنی یاسای ڕووناكی و بەدیهێنانی ژیانی پارێزگارانی بەتواناو سەربەرزی نابێت.

## بەرچاوڕوونیی ڕاستەشەقام و هێزی ڕزگاربوونە:

لەوساتە وەختانەدا کە گەلان و لەناوگەلانیشدا بیرمەندان و دەمڕاستەکانیان خۆیان ناناسن و لە ڕاستەقینەی ڕەوت و بەرنامەی خۆیان دڵنیا نابن، ئەوان لە کەسێکی سەرگەردانی ناو بیابان دەچن کە ئاراستەیەکی دیارینەکردووە تا وەکوو بە برشت و بەبڕیارەوە پێیدا بڕوات.چونکە تەنها هیوای رزگاربوونی کەسی سەرگەردان ئەوەیە کە بڕیار بدات بە بێ دوودڵیی ڕێگایەکی تاقانە لەو بیابانەدا هەڵبـژێرێت _ لەو هەل و مەرجانەدا کە ئەوی پێدا تێپەڕ دەبێت _، لەو ڕووەوە کە زۆربەی ئەوانەی لە وێڵەڕێگاکانی بیاباندا لەناودەچن ئەو کەسانەن کە بڕیارنادەن و ئاراستەڕێیەك بۆ خۆیان دیاریناکەن و بەردەوام ڕێگا دەگۆڕن، و ئەوەندە ڕاڕا و دوودڵن لە نێوان ئەم ڕێگا و ئەو ڕێگا، تا سەرەنجام لە بازنەکانی ونبوون و تیاچووندا خۆیان دەبیننەوە.

گرنگترین هۆی شکست و دواکەتنی نەتەوەکەمان بریتییە لە نەبوونی بەرچاوڕوونی و سەرسامبوونی ڕووناکبیرەکانی بە خۆرئاوا و چاولێگرتنی، بە بێ ئەوەی لێی تێبگەن و بەبێ ئەوەی باش و خراپ و پاك و پیسی لێجیابکەنەوە و هەروەها ڕاڕایی و دوودڵییان لەوەدا کە ئایا شتی باش و نوێ و گونجاویان لێوەربگرن بە هۆشیارییەوە[1]، یا کوێرکوێرانە و شەیدایانە دوایان

[1] زۆر لە بەها و بایەخەکان لە ڕۆووی مرۆیی و ژیارییەوە ناتەواو و ڕووخێنەرن ئەگەر تەنها لە بازنەی خۆپەرستی و ڕەگەزپەرست و ناسیۆنالیزمدا خەشاربدرێن، بۆ نمونە هاوپشتی و هاوکاریی، ئەگەر ببرێتە بازنەی مرۆڤایەتییەوە دەبنە بەها و چەمکی پۆزەتیڤ و بنیاتنەر و شارستانی، ئەمەیە ئەو چەمکە ئیسلامییەی کە برایەتی و هاوسۆزی و ئاشتی و ئاسایش لە جیهاندا جێگیر دەکات، لەلایەکی ترەوە زۆر گرنگە بۆ هزر و ژیاری ئیسلامی کە گرنگیی بدرێت بە میکانیزم و ئامرازەکان بە تایبەت دروستکردنی دام و دەزگاکانی وەکوو پارلەمان و میکانیزمی کارکردنی، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، هەڵبژاردن، وێڕای پێویستبوونی گەشەیدانیان، بۆ کەمکردنەوەی ڕۆڵی

بکەون؟! بەم کارەش دیارە بە هێز و بڕشتەوە بە ڕێگاکانی ژیان و تێکۆشاندا ناڕۆن، کە ئەمەش گەورەترین کۆسپە لە بەردەم ڕێنێسانسی ئوممەتدا و ڕێگرە لە بەردەم بزاڤی ریفۆرم و سەرهەڵدانی وزە و تواناکانی و ڕەوتی کاروانەکەیدا، هێزی لاواز دەکات و ناهێڵێت پەیامی مرۆڤانە و خێرخوازانە بگەیەنێت و جێگیر بکات.

پەیامی ئاسمانیی ئیسلام لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی راستی پێغەمبەرە ئازیزەکەیداﷺ، بە پێی وادەی خودا وەك خۆی پارێزراوە و گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، مرۆڤایەتی ئێستاش زۆر پێویستی بە ڕێنماییەکانیەتی، ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر لەبەر ئەو دڕندەییە وێرانگەرەی لەسەریەتی، کەواتە بەدەر لە ریفۆرم و دووبارە بەرجەستەکردنی ئەم پەیامە، مسوڵمانان ئەرکێکی گەورەتریان لەسەر شانە، ئەویش چاککردنی ژیاری مرۆڤایەتی و ڕزگارکردنی گەلانە، لە کەڵبەی یاساکانی جەنگەڵ و هەموو ئەو خراپەو وێرانکارییەی بە شێوەیەکی دوورتر و ترسناکتر لە هەناویدا هەیە، کە ئەگەر پیاچوونەوە و چاکسازی تیا نەکرێ، بێگومان مرۆڤایەتی بەرەو تیاچوون و نەمان دەبات بەپێی ئەو گیانە دڕندەیی و ڕەگەپەرستانە ودوژمنکارییەی کە هەیەتی. ڕووداوەکانی سەدەی بیستەم و ئەو ستەم و جەنگانەی لە سەرەتای سەدەی بیست و یەك زایۆنیزم و خۆرئاوا هەڵیانگیرساند، بەو ڕەهەندانەوە کە بۆ مسوڵمانان و هەموو مرۆڤایەتی پێیان بوو، تێکڕا وریاکەرەوەی ئێمەن سەبارەت بەو مەترسییە گەورانەی پێویستە هەموو بیرمەندانی جیهان بە

---

خراپی سامان و بەرژەوەندیی تایبەت، هەروەها گرنگیی بدرێت بە دەزگا و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان لە بواری ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیدا.

گشتی و مسوڵمانان بە تایبەتی ڕووبەڕووی ببنەوە و بە هەندی وەربگرن، پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت.

بەرچاوڕوونی مسوڵمان سەبارەت بە سروشتی مرۆڤانەی خۆی و ئەو ململانێیەی تیایەتی لە نێوان رووح و گڵ، ڕووناکی و تاریکی، ڕەوا و ناڕەوا، دادگەری و ستەمدا، بەرچاوڕوونی سەبارەت بە پیلانی شەیتان لەلایەك و ئەرکی خودسازی و چاکسازی لە زەویدا، بۆ خۆی فاکتەرێکی بنەرەتییە بۆ ریفۆرمی خود و ڕووبەرووبوونەوەی زۆرانخوازییەکانی خۆرئاوا و ستەمگەرییەکانی یاسای جەنگەڵ، بەمەبەستی کاریگەری و مامەڵەی ئیجابییانەو ئەکتیڤ لە گەڵیان و بەدەستهێنانی هێز و توانای کردەیی تەکتۆلۆژیا، کە ئەوان کردوویانە بە چەکی خۆیان، لە هەمان کاتدا بە هاوکاری لە گەڵ ڕەگەزە خێرخواز و ئاشتی خوازەکانی مرۆڤایەتی لە خۆرئاوا و خۆرخەلات، کاربکەن بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی نێودەوڵەتی کە یاسای ڕووناکی و راستی دادگەری حوکمفەرمای بێت، نەك یاسای حەنگەڵی ستەمگەر و ڕەگەزپەرست، کە هەموو مرۆڤایەتی بەرەو جەنگە جیهانی و ناوچەیی و ناوخۆییە ستەمگەر و وێرانگەرەکان راپێچ کردووە.

پێویستە مسوڵمان و هەموو پێڕەوانی یاسا ڕووناکە ئاسمانییەکان ئەوە بزانن کە ئەوان بە ڕوونی و ڕووناکی ڕووحەوە ڕووبەڕووی یاسای جەنگەڵ و تاریکییەکانی و هەروەها دڕەندەیی و گڵپەرستییەکەی دەبنەوە، ئەوان لە ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان روونـاکی و تاریکی، نێوان راستی و دادگەریی و ناڕەوایی و ستەمدان، کەواتە هەم ئەوان و هەم رووح و ڕووناکی پێویستیان لە هێز هەیە بۆ نەهێشتنی ستەمگەری و دەستدرێژی و بۆ بەرزکردنەوەی ئالای راستی و دادگەری. بە هەمان شێوە کە پەیڕەوانی یاسای تاریکایی جەنگەل

بـەدوای هێـزی سەرکێـشەوەن، بـەو هێـزەش دیـدگا و کـەلتووری خۆیانیـان سـەپاندووە بەسـەر نەتـەوەکانی دیکـەدا و بـەزۆری زۆرداریـش سـەرکوتیان کردوون تاوەکوو بەخواست و مەرامەکانیان بگەن، واتەپێش هـەر شـتێك دەبێ پەیڕەوانی ڕووناکیی خۆیان چاکبکەن، تا دەربـازکردنی خۆیانیـان بـۆ مـومکین بێت.ئەمـەش تـەنها بـە مەعریفەیـەکی زانستی ئەنجامـدەدرێت، سـەبارەت بـە چۆنیەتی پەروەردەکردنی مـسولمان هـەر لـە منداڵییـەوە، تـا ببێتـە کەسـێکی زانـستخواز داهێنــەر بــەتوانا و حــەزی لــە تێکۆشــان و کــار و وردەکــاریی و بەدەستهێنانی ئامرازەکانی هێز و سەرکەوتن بێت، کە ئوممەتی خـۆیی دەربـاز کرد ئەوسا دەتوانێت ببێتـە هێـز و نموونـە و پەیامەکـەی بگەیـەنێت و مـرۆڤ و ژیاری مرۆڤایەتیش ڕزگار بکات.

هیز بۆ خۆی فاکتەرێکی هاوبەشە لەنێوان یاسـای ڕوونـاکی – واتـە یاسـای ڕووح و دادگەری– و یاسای جەنگەڵ – کە بریتییـە لـە یاسـای گڵـی بێگیـان و نـزم و خـاڵیی لـە گیـان بـە هـەموو پیـسایی و ئـارەزووات و دەسـتدرێژی و ستەمگەرییەکەوە کـە هەیـەتی – یاسـای جەنگـەڵیش بـە تـەواوی دژی یاسـای ڕووحـە بـە هەمووئـەو سـۆز و تاسـەو مانـا و بـەها و بڵندایەتییانـەوە کـە رووح هەیەتی، لە بەر ئەمە دەبێـت و پێویـستە پـەیڕەوانی یاسـای ڕوونـاکی توانـا و هێزیان بە دەستەوەبێت، چونکە هێز ئامرازێکی پێویستە بۆ هەموو لایەنـەکانی ململانێـی مرۆڤایـەتی، ئەوەنـدە هەیـە کـە ئامـانجی هێـز لـە یاسـای رووناکیـدا جیاوازە لە هی یاسای جەنگەڵ، لە یاسای رووناکیدا بەکاردەهێنرێت بۆ راسـتی ودادگەری، کەچی یاسای جەنگەل بـۆ سـەرکوتکردن و سـتەمگەریی ئاراسـتەی دەکات.

ئەمڕۆ کە چنگی یاسای جەنگەل بە خوێنی مرۆڤایەتی سووربووە وکەڵبەی هێزەکانی سەرکەش و سەرکوتکەری داگیرکەران جەستەی مرۆڤایەتییان لەت و پەتکردووە و بەهۆی ئەو بێدادی و دەسەڵاتە ناهەموارەی تووشی ڕۆڵەکانی نەتەوەی ئیسلام و نەتەوە ژێردەستەکانی دیکەبووە، لە ئەنجامی گیانی درندەیی و ڕەگەزپەرستی کە زاڵبووە بەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتیی وڵاتەکانی خۆرئاوادا، کە بێزراوترین شێوەشی لە زۆر شوێنی جیهانی ئیسلام و وڵاتانی ژێردەستیدنیادا دەبینین، وەك دۆخێك و دەرەنجامێك بۆ ئەو چاڵە حەیوانییە قووڵەی مرۆڤایەتی ماددیگەرایانە تێیکەوتووە لەم سەردەمەدا، هەربۆیەشە کاردانەوەی توندوتیژ دەبینین لەم ڕۆژانەدا.

کەواتە پێویستە هەموو مرۆڤایەتی و دنیای شارستانێتی شارەزای مەترسییەکانی یاسای جەنگەڵ بن و تێبکۆشن بۆ دووبارە هێنانەوەی رووح و بایەخەکانی رووح و ئامانجەکانی رووح و لە باتی یاسای ستەم و خراپەکاری یاسای حەق و دادگەری جێگیر بکەن، واتە واز لە یاسای جەنگەڵ و ئەم هەڵسەکەوتانە بهێنن، پێش ئەوەی شەڕی خوێناوی ومادی و ئاژەڵیانە بە کەڵبەی چەکی کۆمەڵکوژی بەرهەمهێنراوی ئەم ژیارو ئەم یاسایە هەر هەموویان قەلاچۆ یکات.

ئەمەش ناکرێت و سەر ناگرێت بەبێ دروستبوونی کۆمەڵگایەکی مرۆڤانەی نێودەوڵەتی راستەقینەی دامەزراو لە سەر ئەو فەلسەفەیەی ئیسلام بۆ ئاشتی و ئاسایش و بەهاکانی هەق و دادی مرۆڤانە هێناویەتی، بۆ ئەوەی ببێتە بناغەی یەکێتی مرۆڤ لە چەند بازنە و جوغزێکی یەك لەناو یەکدا، لەسەر بنەمای چاکەو هاوکاری و هاوپشتی ئاڵوگۆڕکراو، نەك لە سەر بناغەی ناسیۆنالیزم و ڕەگەزپەرستی و یاسای جەنگەڵ کە گەلان و نەتەوەکان بە

چەند زیندەوەرێکی شۆق وەشێن و چەند ڕانە ئـاژەڵێکی بەشـەڕهاتوو و چـەند ڕمێکی دژبەیەك وێنادەکەن [1].

پێویستە ئەوەش بڵێین کـە لادانـی گـەلانی خۆرئـاوا لـە یاسـا ڕووناکـەکانی ئاسمان لە ڕووی مێژووییەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەسـکاریکردنی ئـەو یاسـایانە و بۆ خراپەکاریی ناو دەزگا ئاینییەکان، لەبەر ئەمەشە کە زۆرینەی جـەماوەریان ئاگایـان لـە نـاوەرۆکی ئیـسلام و ئاینـە ئاسمانییـەکان نییـە،– بـە پێـچەوانەی زۆرینــەی سیاســەتوان و بڕیارســازەکانیان کــە وان لــەژێر دەســەڵاتی چــەند دەستەیەکی کەللەرەق و خاوەن بەرژەونـدی و تـەماحی تایبەتـدا – گـەلانێکی سەرلێـشێواون و پێویـستە بـانگخوازە مـسوڵمانەکان بـە تایبــەت هــاوڵاتیی و هاوزمانـە مـسوڵمانەکانی خۆیـان تێبکۆشـن بـۆ بـانگکردن و تێگەیانـدنیان لـە یاسای دادگەری خوایی، گیانپەروەر و ڕووناك، لە بەر قـازانج و ڕێنمـایی مـرۆڤ، کە بێ گومان ئـەرکی مـسوڵمانان زیـاتر دەکـات، سـەبارەت بـە تێگەیـشتن لـە شەریعەتەکەیان و بەرجەستەکردنی و چاکسازی لـە خۆیانـدا بـەو شـەریعەتە و ئاسـانکردنیڕێگاکانی بـانگکردن و گەیانـدنی بـە مرۆڤایـەتی و راسـتکردنەوەی رەوتـی شارستانێتی و پاراستنی لە تەڵەی خراپەکاری و کوشتار، کە بێ وچـان پاڵی پێوەدەنێن بەرەو دۆڵی تیاچوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: (اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ) (٣٥) النور.

قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ(١٥) المائدة.

كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِـرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ(١) إبراهيم.

---

[1] بروانە پەڕاوی: (النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية: اتجاهات جديدة للفكر و المنهجية)ی د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوو سلێمان و تەرجەمەی: د. ناصر أحمد المرشد البراك، ریاز – شانشینی عەرەبستانی سعوودی.

وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ (٨٥) الحجر.

إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً(٧٢) الأحزاب.

قَدْ جَاءتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ (٥٣) الأعراف.

هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ(٣٣) التوبة.

قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٣٣) الأعراف.

وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ (٧١) المؤمنون

فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ(٢٠) الأحقاف.

إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعاً بَصِيراً(٥٨) النساء.

إِنَّ الله يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ و الإِحْسانِ و إِيتَآىء ذي القُرْبى وَيَنْهى عَنِ الفَحْشاء وَ المُنْكَرِ و البَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ(٩٠) النحل.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ(٨) المائدة.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيّاً أَوْ فَقَيراً فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً(١٣٥) النساء.

وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً(٦٣) وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّداً وَقِيَاماً(٦٤) وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَاماً(٦٥) إِنَّهَا سَاءتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَاماً(٦٦) وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَاماً(٦٧) وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً(٦٨) يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً(٦٩) إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً(٧٠) الفرقان.

أنّه مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّما قَتَلَ النّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْياها فَكَأَنَّما أَحْيا النّاسَ جَمِيعاً(٣٢) المائدة.

وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ(٢٠٤) وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيِهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ(٢٠٥) وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ(٢٠٦) البقرة.

وَالَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللّهِ مِن بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللّهُ بِهِ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُوْلَئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ(٢٥) الرعد.

أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ(١) فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ(٢) وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ(٣) فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ(٤) الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ(٥) الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ(٦) وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ(٧) الماعون.

مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ(٤٢) قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ(٤٣) وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ(٤٤) وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ(٤٥) وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ(٤٦) المدثر.

َفهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ(٢٢) أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ(٢٣) محمد.

لاَّ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوَءِ (١٤٨) النساء.

الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ(٢٦٨) البقرة.

وَإِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءنَا وَاللّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء أَتَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٢٨) الأعراف.

وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَداً وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ(٢١) النور.

إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ(١٩) النور.

وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ(١٥١) الأنعام.

وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ(١٩٠) البقرة.

وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَـذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّاً وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيراً(٧٥) النساء.

لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(٨) الممتحنة.

يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ(٢٦) وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ(٢٧) أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ(٢٨) ص.

وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ(٢٠) الأحقاف.

يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ(١٣) الحجرات.

الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ(٨٢) الأنعام.

وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً لاَّ مُبَدِّلِ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ(١١٥) وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللّهِ إِن يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ(١١٦) الأنعام.

ثُمَّ رُدُّواْ إِلَى اللّهِ مَوْلاَهُمُ الْحَقِّ أَلاَ لَهُ الْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ(٦٢) الأنعام

إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ(٥٧) الأنعام.

## کلیلی مامەڵە لە گەڵ ئەویتر: ناسینی مەنهەجیانە، ناوەند و بەشەکانی خۆرئاواناسیی

خۆرئاوا بەمەبەستی تێگەیشتنی گەلانی دیکە، توێژینەوەکانی خۆرهەڵاتناسی[1] دامەزراند، ئەم کارەش بە پێی یاسای جەنگەڵ و هەوڵی تالآنکردنی ئەم گەلانە ئەنجامدرا، هەربۆیە تێگەیشتن لەم گەلانە بەو مەبەستەیە کە هەندێکیان ڕاو و هەندێکی تریان داگیر بکرێن، واتە سەرکوتبکرێن وبەکاربهێنرێن بۆ ویست و خواستی خۆرئاوا، ئومێدوایە کە گەلانی مسوڵمان و بیرمەند و ڕووناکبیرەکانیان واز بهێنن لەو کەمتەرخەمی و لاوازی و خاوبوونەوەیەی پێوەی گرفتاربوون، بۆیە پێویستە لە وڵاتەکانیاندا — لە دووتویێی بەرنامەکانی ریفۆرم و هەستانەوەدا— ناوەندگەلێك بۆ توێژینەوەی زانستی و چەند بەش و بەرنامەو پلەی ئەکادیمی دابمەزرێنن، و هەوڵەکانیان بۆ تێگەیشتن لە خۆرئاواو بیری خۆرئاوایی تەرخانبکەن. تێگەیشتن لە سروشت و دەستپێکەکانی، تا بتوانن لێیحاڵیی بن و بە هێزەوە مامەڵەی لە گەڵ بکەن و ژیارەکەشی بەرەو ئاراستەیەکی باش واتە بەرەو بەرژەوەندیی هەموو گەلانی مرۆڤایەتی ڕێنمایی بکەن، بەتایبەتی ئەوانەی کە وان لە ژێر ڕکێفی ویستە ڕەگەزپەرست و ناسیۆنالیستییە دوژمنکارییەکانی یاسای جەنگەڵدا، وێڕای جۆرەها ڕووکەش و چەواشەکردنی پڕوپاگەندە و

---

[1] سەیرە بە سیخوڕ و تێکدەرە کانی زایۆنییە ئیسرائیلییەکان کە خەریکی توێژینەوەن لە زمان و کەلتووری عەرەبیدا دەڵێن: بەعەرەبکراو، لە حاڵێکدا ئەوانە نە بە عەرەبکراون و نە دەچنەوە سەر عەرەبایەتی، بەڵکو هیچ پەیوەندییەکیان پێوە نییە و تەنها دوژمنانێکی تێئاخنراون، بۆیە باشتروایە پێیان بگوترێت: بەعەرەبنیشاندراو (المعوربين) لەسەر کێشی (معجرمين، معجرفين، مقولبين) واتە کەسانێك کە بەفێڵ و گزی خراونەتە ناو جەماوەری عەرەبی ستەملێکراوەوە.

ڕاگەیانـدن، بەمەبەسـتی گـومڕاکردنی جـەماوەر و ئاسـانکردنی سـەرکوت و دەسەڵات و تـاڵانکردن لەلایـەن کۆمەڵـە و یەکێتییـە ناسـیۆنال و ڕەگەپەرسـتە کۆلۆنیالییە گەورەکانەوە، کە هەنووکە گەردنبەندی کەوانە ترسناکەکەی تـەواو بووە و بـە چەشـنی بازنەیـەك مەچـەکی ئوممـەتی گـەمارۆداوە.و چارەنووسـی جیهانی ئیسلام و ئەفەریقایان بەدەستەوەیە، و پارچەپارچەی دەکەن، یەکێتی ئـەورووپا لـە پـەنای یـەکێتی ئەمـەریکا و یـەکێتی ڕووس و هیندسـتان و چـین سەریهەڵداوە، هەربۆیـە جیهـانی ئیـسلام وئەفـەریقا وێـڵ و لـەت وپەتـە و تێـك بـەربوون و بوونەتـە نێـچیر بـۆ تـەماعکاران و بـۆ ڕاوچـییانی خۆرئـاوایی و هەوبەشەکانی و بۆ تانجییە زایۆنییەکەی، ئەو تانجییەی لـە ڕاسـتیدا سـەگێکی دڕنـدە و گـورگێکی ناپـاك و شـەڕانییە و تـەماعی تایبـەتی خـۆیی هەیـە، واتـە خاوەنەکی تووشی بـەڵا دەکـات و پـێش ئـەو چـڕنووك لـە نێـچیر گیردەکـات و تەنانەت شەرم لە پەلاماری خاوەنەکەی خۆیـشی ناکـات، بـەڵام چـوون ڕاوچـی دەبێ نێچیرێکی هەبێت کە ئەویش جیهانی ئیسلام و ئەفەریقایـە، ئـەوا ڕاوچـی هیچ کاتێك ناهێڵێت کە نێچیرەکە ڕۆڵی تانجی ببینێت، وەکوو ئەوەی زۆر کەس بە خەیاڵیانـدا دێـت، بـەهۆی ئـەو لاوازییـەوە کـە تێیـدا دەژیـن، بـەو هیوایـەی خۆرئـاوا قایـل بکـەن – لەسـەر بنـەمای گیـانی مافپەروەرانـە و دادگەرانـە– پــەیڕەوی سیاســەتگەلێکی دادگەرانــەی هاوســەنگ بکــات بەرامبــەریان، کــە ڕێگربێــت لــە تەشــقەڵە و دەســتدرێژی و ســتەمی ئیمپریــالیزم و تاوانــەکانی زایۆنیزم. لەڕاستیدا – لە سـێبەری یاسـای جەنگەڵـدا – ئـەوە خـەیاڵی خـاوە، چـونکە کاریگەرییــەکی لــەو چەشــنە کــە پــشت دەبەســتێت بــە میکــانیزمی پڕوپاگەنـدەو دیپلۆماسـییەتێکی ڕووت، هــەم دانــسقەیە و هــەم سـنووردار و

کاتییەو لە ڕەوتی پەیوەندییە نێودەوڵەتیە هاوچەرخەکان و لەژێر سایەی مەبەست و سیاسەتەڕەچاوکراوەکاندا بە هەند وەرناگێرێت.

کەواتە تاکە ڕێگایەك کە حاڵی حازر ڕەنگە کاریگەری هەبێت لەسەر سیاسەتی ئەم دەوڵەتانە بە شێوەی میکانیزمی ئاشتییانە و لە چوارچێوەی یاساکانی کایەی سیاسەتی ناوخۆیی وڵاتەکانی خۆرئاوا، بریتییە لە هەوڵە سیاسییەکانی هاوڵاتییانی مسوڵمانی ئەم وڵاتانە و ئەو هاوڵاتییانەی تریان کە پشتگیرییان لێدەکەن، واتە ئەو کەسانەی تروسکایی ڕووناکی پەیامە ئاسمانییەکانیان پێیە و ئەو ستەملێکراو و خاوەن ویژدانە زیندووانەی هاوکارییان دەکەن. هەرچەندە ئەم یاسایانە مەرج نیە لە ژێر باڵی یاسای جەنگەڵ و بەرژەوەندی داڵەکەرخۆرەکاندا بەردەوام بن، بۆ هیچ گرووپێك یان کەمینەیەك، تەنانەت بۆ کەمینەی زایۆنیش. لەماوەی نێوان دوو جەنگی جیهانیدا ئەوەی لە ئەڵمانیا و لە ئەمەریکا ڕوویدا، سەبارەت بەو ڕەنج و مەینەتیانەی زایۆنیزم بۆ خۆرئاوای درۆوستکرد لە جیهانی ئیسلام و جیهانی باشووردا، هەر هەموو پەند و عیبرەتگەلێکی وەهان کە هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر لەبیر بچێتەوە یان فەرامۆش بکرێت، یاخود ئەزموونی پێشووتری چڵێسی و پیلانگێڕان و ستەمگەری و خراپەکارییان لە زەویدا، هەر لە سەردەمی ڕۆمان و پێش ڕۆمانەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ.

ئەگەر مسولمانان ڕێگا بدۆزنەوە و هەوڵەکانی ریفۆرم دڵسۆزانە بێت و بە برشتەوە لە خۆرئاوا دا بانگەواز بۆ خودا بکرێت، بەو تروسکایی گیان و سروشتە پاکانەوە کە لە دەروونیاندا ماوە، ئومێدی ئەوە هەیە کە یاسای ڕووناکیی لەوێدا جێگیر ببێت و ئەم گەلانە بگەڕێنەوە بۆ ڕیگای ڕووناکی و دادگەریی.

جیهـانی ئیـسلام و ئەفـەریقاش ڕێگـای دەربـازبوونی نیـە، لـە دواڕۆژدا بـۆ ئەوەی خۆی ڕزگاربکات و ماف و سەروەریی خۆی بسەنێتەوە و بەشداربێت لە دەسکەوتی ژیاری مرۆڤایەتیدا. جگە لـەوەی بـە توانـا و هێـزەوە لـە سـەرپێی خۆی بوەستێت و هاوتا و هاوکاری هێزەکانی چاکەو چاکسازیی بێت.

لەم ئاراستەیەدا ساڵانێکە زانکۆی ئیسلامیی جیهـانی لـە مالیزیـا، هـەنگاوی یەکــەمی هاویــشتووە، بــە دامەزرانــدنی پــسپۆڕییەکی وردیلــە MINOR SPECIALIZATION لـە توێژینـەوەکانی خۆرئـاوادا، بـە مەبەسـتی دانـانی بـەش و پـسپۆڕییەکی سـەرەکی توێژینـەوەکامی خۆرئـاوا، بـۆ تێگەیـشتن لـە خۆرئاوا، لە هزرو بنەماکانی، و دیـاریکردنی ڕێگاکـانی هاوکـاری و کـارلێکردنی ئیجابییانـە لـە گـەڵی، بـەرەو تەواوکارییـەکی بـاش و هاوبەشـییەکی مرۆڤانـەو دادگەرانە، لە سەر بنەماگەلی راستی وداد و هاوپشتی مرۆڤانە چاك و بنیاتنـەر، لە دەستپێکەکانی یاسای ڕووناکییەوە نەك یاسای جەنگەڵەوە، بۆیـە هیـوادارم ئەم زانکۆیە لەسەر ڕیازەکەی بەردەوام بێت، و هەنگاوەکـەش بـە دامەزرانـدنی بەشێکی زانکۆیی و پلان و ناوەندێك بۆ خوێندنی باڵا لە بـواری توێژینـەوەکانی خۆرئاوا، تەواو بکات.

وا چـاوەڕوان دەکرێـت بەرنامـەی کـاری زانکۆکـە تێـر و تەسـەل ببێـت و زانکۆکانی دیکەی جیهانی ئیـسلام و جیهـانی سـێیەم وەك ئـەو هـەنگاو بنـێن، تیایانـدا بەرنامـە و ناوەنـدی زانـستی و توێژینـەوە لـە بـواری توێژینـەوەکانی خۆرئاوا دابمەزرێت، تاوەکوو بناغەیەکی شارستانیی ساغ و کاریگەر بۆ دیالۆگ و تــەواوکاری ژیارەکــان دابڕێــژرێت، نــەك ململانــێ و ســتەم لــە یــەککردنی ژیارەکان.

لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُـؤْمِن بِاللّـهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ(٢٥٦) البقرة.

ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِـالَّتِي هِـيَ أَحْـسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ(١٢٥) النحل.

لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الـدِّينِ وَلَـمْ يُخْرِجُـوكُم مِّـن دِيَـارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْـسِطِينَ(٨) إِنَّمَـا يَنْهَـاكُمُ اللَّـهُ عَـنِ الَّـذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَـن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ(٩) الممتحنة.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَـنَآنُ قَـوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَـبِيرٌ بِمَـا تَعْمَلُـونَ(٨) المائدة.

وَقَـاتِلُواْ فِـي سَـبِيلِ اللّـهِ الَّـذِينَ يُقَـاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَـدُواْ إِنَّ اللّـهَ لاَ يُحِـبِّ الْمُعْتَدِينَ(١٩٠) البقرة .

## گەڕانەوە بۆ سەرەتا:

## ڕووناکیی بڕوا و بەرنامەی شوورا و هێزی برایەتی

مـسوڵمانان پێویـستە ئـەوە بـزانن کـە هـۆی سـەرگەردانییان بریتییـە لـە نـەبوونی بـەهاکانی ئـازادی و شـوورا و لێبـوردەیی و برادەریـی ئیـسلامی و برادەریـی ئینـسانی، نـەبوونی بـەهاکانی ئـازادی بـڕوا و بـیر و بۆچـوون، سەرەنجامیش ونبوننی مافەکانی مرۆڤ و گەورەیی مرۆڤ. لـەجێی ئـەم بەهایانـە بەهاکانی دیکتاتۆری و ستەمگەری و ڕەگەزپەرستی و ڕەگپەرستی هۆزایـەتی و

شعووبیگەری و تایەفەگەری پەیدابوون، لە ئەنجامدا ئوممەت لـە زەلکاوەکـانی پەرتـەوازەیی و دژبـەخۆیی و سـتەم لەیـەکتری کـردن و دواکەوتنـدا ڕۆچـووە، کەلتوورەکـەی ئـالوودە و عەقلییـەتی زانـستیی وێـران بـووە، خورافـات و چاوبەسـت بـڵاوە و هەسـتکردن بـە تـرس و ترسـنۆکی جـێگیر، واتـە ئوممـەت گرفتـاری دەردی کۆیلـەکان بـووە، ترسـاو و ترسـنۆك و ملکـەچ و لاواز [1] بۆیـە پێویستە ئەم ئوممەتە دووبـارە خـۆی دروسـت بکاتـەوە، بـە ڕێنمـایی بنـەمای تەوحید و چەمکی جێنشینایەتی، لە دەستپێکی دادگەری و یەکێتی مرۆڤـەوە، ئەویش بە هێنانـەوەی بـەهاکانی ئـازادی و شـوورا و لێبـوردەیی و بـرادەری، و سیفەتەکانی ئازایەتی و دەستپێشخەری و ڕاستگۆیی و دەستپاکی، تا بتوانێـت هێزی جاران و یەکپارچەیی جاران و دامـەزراویی جـاران دەسـتبخاتەوە، تـا وە کوو ببیتە پێشڕەو و سەرکردە بەرەو چاکەو ئاشتی، بە نموونە و بـە دانـایی و بە مەوعیزە و بانگەواز بۆ ڕێگاکانی ڕووناکیی و ئاسایش و ئاشتی، بە جوانترێن شێوە، لە پشت هەموو ئەمانەشـەوە هێـز و دەسـەڵاتێك هـەبێت بـۆ پاراسـتنی خاك و جێگیرکردنی ماف و بەرگریی لە زۆرلێکراوان.

## هەموو پرسێك وەڵامی نییە

بەڵام بۆچی ئەم دووجیهانی رووح و ئەستۆیە لـە مرۆڤـدا بەیـەك گەشـتن، و ئەم زۆرانەی نێوانیان چ مانایەکی هەیە، کە هەندێکیانی پێبەرزدەبێتەوە — بە پێـی کۆشـشی دەسـتی کارچـاکان — بـەرەو پاکبوونـەوەی رووح و بەهەشـتی

---

[1] بڕوانە کتێبی: (الطفولة: البعد الغائب في مشروع اصلاح الأمة) د. عەبدولحەمید ئەحمـەد ئەبووسـلێمان، مؤسسة تنمية الطفولة، هرندن، فرجينيا، ۲۰۰۳م.

هەمیشەیی و هەندێکی تریش – بە تاوانی دەستی خراپەکاران– لە بەدەبەختی و سزای هەمیشەییدا ڕۆدەچن؟ ئەبێ ئەم ململانێیە کە ڕووح گرفتاری بووە لە ئاستی ویست و حەزەکانیەوە چ واتایەکی هەبێ؟ ئینجا چۆن دەبێت مرۆڤێکی ئافەریدە کە هەموو شتێکی دروستکراوە، خاوەنی ویستێکی ئازاد و بەرپرسیار بێت؟ هەموو ئەم پرسیارانە بە ئاسانی وەڵام نادرێنەوە، بەڵام دەزانین کە بەم تێکۆشانەیە مرۆڤەکان خۆدی خۆیان رامدەکەن و رادەهێنن لە سەر ئەوەی بە هۆی ڕوناکییەوە بەرەو حەق بڕۆن. هەروەها لە ناخی خۆمانەوە ئەوەش دەزانین کە مرۆڤ واتە گیانە ئەفرێنراوەکە، بەشە وردیلە خاوەن لۆجیکە سنووردارەکە قەت ناتوانێت – بە سەربەخۆیی– بیابانی ئەم ژیانە ببڕێت و بگاتە ئامانجە گەورەکانی ژیان، بە بێ ڕۆشنگەری و ڕێنماییەکی ڕووناکی خودایی، کە لە ڕێگاکانی بەرپرسیارێتی و جێبەجێکردنی ئامانجەکانی بوونی شارەزای بکات، هەموو ئەمانە شتانێکن کە مرۆڤ لە ناوەوەی هۆشیاری و کرۆکی خۆیدا هەستیان پێدەکات، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ بە هەموو ژیری و داناییەکەوە سووربێت لەسەر ڕێنمایی ڕوناکی خودایی و پەیرەویی لە بەرنامەکەی بکات، بۆ ئەوەی توانای هەڵگرتنی ئەرکە خێرخوازەکەی لە ژیاندا هەبێت و لە سەر پایەی بەهاکانی راستی و دادگەری و هاوسۆزی بانگەوازی بۆبکات.

## واتای ژیانی مرۆڤ لە دنیادا: بەرجەستەکردنی بەهاکانی ڕووناکی و بەرزبوونەوەی ئەستۆیی گڵ

هەموو ئەوپرسیارانەی ئاماژەمان بۆکرد، دەبێت بـە هۆشـیارییەوە یـان بـێ هۆشیاری بە زەینی مرۆڤدا بێن و بیریـان لێبکاتـەوە، هەرچـەند ئـەم بابەتتانـە دوورتر لـە دەرککردنـی لـۆجیکی مـرۆڤ بەرچـاو دەکـەون، بـەڵام وادیـارە ئێمـە دەتـوانین هەنـدێك چـەمکی واتـادار لـەم بوارانـەدا بهێنینـە بەرچـاو، لەوانـە بەیەکگەیـشتنی رووح و ڕوونـاکی لەگـەڵ ئەسـتۆ و گـل لـە قـەوارەی مرۆڤـدا، وئامـانجی ئـەم بەیەکگەیشتنە، ئەمـەش خـودی مرۆڤـی کـردووە بـە مەیـدانی ململانێی نێوان ڕووناکی و تاریکی، نێـوان ڕێناسـین و گـومڕایی، نێـوان گیـان و ئەسـتۆ، نێـوان یـاکی و ناپـاکی، نێـوان فریـشتە و زینـدەوەر، نیـوان خـودا و شەیتان. ئێمە لەم بەیەکگەیشتن و ململانێ و ئاراسـتە و شـەڕەپاڵەدا دەبیـنین چۆن ڕووناکی و ڕاستی ودادگەری لە ئەستۆی خاك و گڵدا بەرجەسـتە دەبـن و چۆن چەمکەکان دەبنە ڕاستەقینە لەبەرچاوی مرۆڤدا و چـۆن گـڵ چـەمکەکانی چاکە و ڕاستی و جوانی نمـایش دەکـات و دەیانخاتـە فـۆرمی شـاکاری مـاددی گڵێنەوە بۆ دڵڕوبایی و بردنـی هـۆش و ژیـری، بـەم شـێوەیە چـەمکەکان وێنـە پاکیی و داهێنان و جـوانی دەبەخـشن بـە مـاددە، واتـە لـە ڕێـی ئـەم ژوانـەوە ماناکـانی ڕوونـاکی و حـەق و دادگـەری و سـۆز دەبنـە وێنـە و فۆرمگـەلێکی ڕاسـتەقینەی هەسـتپێکراوی مـاددی، مـاددە وگـڵ دەگـۆڕدرێن بـۆ بەهاگـەل و وێنەگـەلێکی بڵنـد، کاتێـك ماناکـانی ڕوونـاکی و حـەق و دادگـەری و جـوانیی دەپۆشـن و دەبنـە فـاکتێکی بـەرپا و هەسـتپێکراو لـە ژیـان وهـەڵس وکـەوتی خەڵکیدا.

بەم دیدارەی رووناکی و رووح و گڵ وێنـەکانی خێـر و جـوانی بەرجەسـتە و بەرهەست دەردەکەون، بە تایبەتی ئەو وێنە نایاب و جوانانەی لە ژیانی مرۆڤدا و لە ماددەو گڵدا بەرجەستە دەبن دەروونی مرۆڤ خۆشحاڵ دەکەن، کاتێك ئـەو خاك وگڵە نزم و کەم بایەخە دەبێتەجۆرەها جـوانی، جۆرەهـا لـەش و جەسـتە وشکڵ و شێوە و جۆرەها گوڵ و باڵندە و باخ و گوڵزار، بەتایبەتی مرۆڤـی ڕێـك وڕاست کە بۆ خۆی جوانترین بەهرەی خودایی و نوورانییە، خۆ ئێمە ئەگـەر لـە جوانترین لەش و جوانترین شێوە و جوانترین چاو سـەرنج بـدەین، لـە راسـتیدا هیچ نایەتە بەر دیدەمان جگە لە چەند مانا و چەند هێڵ و چەند نیشانەیەك کـە لەی ئەستۆی گڵین وخاکیدا شکڵ و شـێوەیان وەرگرتـووە و پەیـدابوون. بۆیـە جوانی و تاسەکانی جوانی و ماناکـانی جـوانی دڵ وهـۆش دەڕفێـنن، بەهـەمان شێوە ئەگەر لەو وێنەو پەیکەر و لەش و چاوە جوانانە ورد ببینەوە، تێدەگەین ئێمە قەت نەماندەتوانی لەو هێڵ و چەمکانە حاڵیی ببین و بیانهێنینە بـەر چـاو ئەگەر لە ماددە و گڵدا بەرجەستە نەبان، ئەو گڵەی کە دوای نەمان و توانەوەی ئەم جەستە و لەشە جوانانە دەبێتەوە خاك و کـەلاك وقـوڕ ولیتـەی بـۆنکردوو. واتە کاتێك هێڵەکانی جوانی دەسڕێنەوە و جیا دەبنەوە دووبارە ئەو جەستەیە دەبێتە قوڕێکی بۆگەن و زبڵ و چەند مشتە خۆڵێك.

کەوابێت ئای چەند جوانە کاتێك گڵ بە ڕووناکی دەگـات و ماناکـانی خێـر و حەق و جوانی بەرجەستە دەکات و چەند شیرینە کاتێك ڕووناکی دەردەکـەوێت و لە فۆرمی ماددە و گڵ دابەرجەستە دەبێت. ئەوسـاتە حـەق سـەردەکەوێت و بالادەست دەبێ، جوانی دەردەکەوێ و سەری بەرز دەبێ، رووناکی بەرجەستە دەبێت و دەدرەوشێتەوە، بەم شێوەیە تەنانەت ئەو ئاژەڵـەش کـە لـە هـەناوی

مرۆڤدایە بەرز دەبێتەوە و ئەو بەرگە خاکییەش کە گیانی داپۆشیوە پاڵفتە دەبێت.

## وما أوتيتم من العلم إلا قليلا

بەڵام دەبێ گەورەترین ڕاز و دوورترین مانای ئەم دیدارەی رووح و ماددەیە چیبێت؟ و چ ئامانجێکی هەبێت؟ و ئەو ململانێیەی لە نێوان قەوارەی مرۆڤ و ویستی مرۆڤدا هەیە بەرزترین ماناکەی چی بێت؟ و لە راستیدا چ شتێك بەرهەمدێت لەم بەرجەستەبوون و دەرکەوتنە دا کە هەموو گیانەکان بە پێی توانا ڕووەو خواوەندیان دەبزوون و خودییان ڕادەهێنن و جا سەردەکەون و ئارەزووەکان و حەزە ئاژەڵی و خاکییەکانیشیانی پێ پاکژ دەکەنەوە؟ بێگومان هەموو ئەمانە — وەکوو بۆمان دەردەکەوێت لە سنووری تێگەیشتنی خۆماندا— لەبابەتە غەیبی و نادیارەکانە و لەو رازانەی بوونەوەرن کە دەرك و لۆجیکی مرۆڤ نایانگاتێ لەم ژیانەی دنیادا.

قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(٢٠) العنكبوت.

وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً(٨٥) الإسراء.

وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ(٣٨) مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ(٣٩) الدخان.

وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ[1](٥٦) مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ(٥٧) إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ(٥٨) الذاريات.

وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ(١٦) لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْواً لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ(١٧) الأنبياء.

لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ(٢٨٦) البقرة.

قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ(٣٢) البقرة.

لَقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ(٢٢) ق.

ئەم سەرنجانە لە مانا و ئامانجەكانی ئەفراندن و ئامانجی پەیوەندییەكانی — بە بۆچوونی من— بێهوودەنین و ناچنە بازنەی فەلسەفەی تیۆلۆژییاوە كە پشت بەستووبە گومان، لە جیهانی میتافیزیك دەكۆڵنەوە، و بەبێ ڕێنما و ڕابەر، تەنها بەڵگەیەك كە هەیانبێت ئەوەیە كە عەقڵیان غەرڕایەو سنووری خۆی نازانێت.

ئەمە ئەو دەردەیە كە تا كو ئەمڕۆش هەم ئوممەتی ئیسلام بە دەست بەشێك لە ئالۆزییە كەلامییەكانییەوە، و هەم مرۆڤایەتیش لەتاو برێك لە فەلسەفە لاهووتییەكانی دەناڵێنێت، ڕەنگە هەر ئەوەش مەبەستی ئیمامی غەززالی بووبێت لە كتێبی (تهافت الفلاسفة)دا، هەروەها ئەو گومڕایی و

---

1 عیبادەت لێرەدا لە وشەی (التعبید) داتاشراوە نەك لە (الإستعباد)، كەواتە بڕوادار خۆی بۆ خودای ڕاستەقینە دەكاتە كۆیلە، ئەمەش سەرچاوەی ڕێزە بۆ كەسی بڕوادار، نەك مایەی زەلیلی و سووكایەتی و كەمێتی بێت. (ولله العزة و لرسوله و للمؤمنين) المنافقون:٨.

بێبڕوایی و سەرکەشییەش کە لە گومڕایان و بێبڕوایان و نەزانان دەیبینین هەرهی ئەم دەردەیە.

کەواتە سەرنجێك لە چوارچێوەی دەرککردنی سنوورەکانی عەقڵ و لۆجیکی مرۆڤدا بێت بە بۆچوونی من دەچێتە خانەی جیددیبوونی دینداریییەوە و یەکێکە لە ڕێگاکانی پتەوکردنی باوەڕ، کە ڕەنگە پێشەوا ئیبن ڕوشد ئەمەی مەبەست بووبێت لە کتێبی (تهافت التهافت) دا، واتە پێویستە هەقڵ بە بیرکردنەوە و سەرنج تێبکۆشێت بۆ پتەوکردنی باوەڕ و تێگەیشتن لە پەیام، هەوڵبدات ئاسۆکانی زانست و مەعریفە فراوانتر و قووڵتر بکاتەوە.

بەرهەرحاڵ گومان لەوەدا نیە کە پەڕاوی دابەزێنراوی ڕووناکی (قورئان) و سوننەتی پاکی موتەواتیر تاقانەکانیاوی زانستی راستەقینەن سەبارەت بە جیهانی نادیار (غەیب) و هەرئەوانیشن دەبنە سەرچاوە و قسەی کۆتایی و کانگای ئەم سەرنجانەی کە بەمەبەستی بەشداریکردن لە رێدۆزینەوەی مرۆڤی مسوڵمان و ڕێنوینی کاروان و هەنگاوەکەی دەخرێنە ڕوو:

قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي (٢٦٠) البقرة.

من هیوادارم ئەم لاپەڕەیە توانیبێتی برێك سروشتی ئوممەتی مسوڵمان و سروشتی ئامانج و ڕەوت و بەرنامەکانی ئەم ئوممەتە و گرنگیی هەوڵەکانی ریفۆرم و پێداویستی کارکردن بۆ ئیسلامیزەکردنی مەعریفە و یەکبوونی سەرچاوەکانی واتە سرووش و ژیریی و بوونەوەر، ڕوونکردبێتەوە، هەروەها ڕێناسینەوەی بەردەوامی ئەم ئوممەتە بە نەگۆڕەکانی یاسای رووناکی، کە راستییەکی بابەتیانەیە لە بووندا و لەسەر بنەمای تەوحید و یەکێتی مرۆڤەکان بەرپابووە و هەموو هێزێك دەدات بە حەق.

هـەروەها بەئومێـدم – بـە هـەر ئەندازەیـەك بێـت– كـاری تێگەیـشتن لـە خۆرئـاوا، تێگەیـشتن لـە هـزر و ئاراسـتەو ئامـانج و سیاسـەت و هەڵـسوكەوتە هاوچەرخەكانی، بۆ مرۆڤـەكان بـە گشتی و بـۆ مرۆڤـی مـسوڵمان بـە تایبـەتی ئاسان كردبێت، كە لەسەر بناغـەی یاسـای دڕندانـەی جەنگـەڵ دامـەزراوە، كـە ڕەهەنـد و كـۆی هـەمویان لـە مامەڵـە لـە گـەڵ ئـەویتر لـە ئاسـیا و ئەفـەریقا و ئەمەریكای لاتین و بەتایبەت جیهانی ئیسلام دارێژراوە لە سەر یاسای جەنگەڵ واتە لەسەر جیاكـاری و رەگ و ڕەگەزپـەرستی، كـە هـەموو مـاف و راسـتییەك دەدات بە هێـز و هـەموو گوێڕایەڵییـەك بـۆ حـەز و ئارەزووەكـانی گـڵ بـەڕەوا دەبێنێت، و حەقیقەتیش بە پرسـێكی خـودی (نابابەتیانـە) پێناسـەدەكات كـە هیچ بوونێكی واقیعی نەبێت و بەڵكو تەماع و ویـست و ئـارەزوو حـەزەكانن كـە دیاریدەكەن، ئەو یاسایەی بۆ گەیشتن بە ئامانج وبەرژەوەندییـەكانی بەرامبـەر بەویتر تا بتوانێت پشت دەبەستێت بـە سـتەملەیەككردن و دوژمنكـاریی، بـاری ئەم یاسای جەنگەڵـە، بـەهۆی ماناگـەلی حـەق و دادگـەری و سـۆزەوە، كـە لـە سروشت و ناخی گیانی مرۆڤدا چـێنراون و تاسـەی بـۆ دروسـتدەكەن، هەنـدێك جار سووك دەبێت.

بەڵام هەموو شەڕو بەڵاكە ئەو ساتە وەختـە دەسـتپێدەكات كـە شـەیتان و حـــەیوان بـــە یەكدەگـــەن و هـــەموو نیـــشانەیەكی گیـــان و سروشـــتی مـــرۆڤ دەكوژێتــەوە، كەنموونـەی دڕندانـەی هاوچـەرخی ئەمـەش لـە هەڵـسو كـەوتی زایۆنیستەكاندا دژ بە گەلی فەلەستین دەردەكەوێت. ئەنجامەكەشی بریتییـە لـە شـەڕو سـتەم و دڵرەقیـی و وێرانكـردن لـە قێـزەونترین و نـزمترین شـێوەدا، و كۆتایی بە هەموو چەمكێكی ڕووناكی و دادگـەریی و سـۆز دەهێنێـت لـە ژیـانی

مـرۆڤ و لـە هەڵـسوکەوتی گەلانـدا، بـەجیاوازی شـێوەو ڕەنـگ و بـەهاو بـیر و بڕوایانەوە.

## دوای هەموو ئەمانە: بێگومان ئوممەت ڕۆڵی هەیە

مەبەستی ئەم لاپەڕەیە لەم ئانو ساتا سـەختانەدا بریتییـە لـە هەوڵـدان بـۆ پێشکەشکردنی ڕێبەرێکی کـار و بیـنین بـۆ بیرمەنـدانی ئوممـەت، ئەوانـەی کـە خاوەنی ڕۆڵـی سـەرەکین لـە فامکردنـەوەی کاروانەکـەی و رچەشـکێنی بۆیـدا، بۆئـەوەی ئەگـەر ناوەرۆکەکـەی راسـت بـوو — ئـەو ناوەرۆکـەی لـە گەرمـەی وردکردنەوەکان و هەراکان و ڕووبەڕووبوونەوەکاندا ونبووە— یارمـەتییان بـدات بۆ تێگەیشتن لە چەمکی بوونی ئوممەت وکارکردن بـۆ دووبـارە سـاغبوونەوەی بینین و گەڕانەوەی وزەی بڕیارەکانی، هەروەها بۆ ئەوەی هەم ڕێگاکەی و هەم مەبەستی کاروانەکەی بزانێت، تا کارەکانی بـە هێـزو بـە بڕشـتەوە وەربگرێـت، هەروەکوو کەسێك کە ڕێگاو مەبەستی خۆی باش دەزانێت، ئەو هیوایەشم هەیە کە یارمەتی ئەوانیتر واتەپەیڕەوانی یاسای جەنگەڵیش نەخوازەڵا خۆرئاواش — لەمەودای دووریشدا بێـت — بـدات کـە خۆیـان بدۆزنـەوە و لـە هەڵـەو گـومڕایی بگەڕینەوە، و دواتر بەزەییان بەخۆیان و بە مرۆڤایەتیدا بێتەوەو سـنوورێك بـۆ دوژمنکاری و دەسـتدرێژییەکانیان دابنـێن و سـەرەنجام لەسەرشـانی خۆیـان و مرۆڤایەتی هـەموو ئـەو ستەمگەری و تراژیدیایانـە لا بـەرن کـە ئـەمڕۆ پێـوەی گرفتارن و هەرهەمووشیان دەرهاویشتەی سەروەریی یاسـای جەنگـەڵن، تـا لـە کۆتاییدا هەم یاسای ڕووناکی و هەم بەهاکانی دادگەری و تـەبایی و ئاسـایش و ئاشتی باڵادەست بن بە سەر هەموو مرۆڤایەتیدا.

هەموو سەرکەوتن و ڕێناسییەك هەر بە دەست خودایە و هەر ئەوە باشترین پشتیوان و باشترین کۆمەککار.

# د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان



* لە مەککەی پیرۆز لەدایکبووە، ساڵی ١٣٥٥ ك / ١٩٣٦ ز.

* قۆناغی سەرەتایی و دوا اوەندی لە مەککە تەواوکردووە و لە قوتابخانەی ئامادەیی نێردراوان بۆ دەرەوە دەرچووە ساڵی ١٣٧٣ك / ١٩٥٥ ز.

* بەکالۆریۆسی بازرگانی لە زانکۆی قاهیرە بەدەستهێناوە ١٣٧٨ ك / ١٩٥٩ز.

* پلەی ماستەری لە زانستە سیاسییەکان وەرگرتووە، لە کۆلیژی بازرگانیی زانکۆی قاهیرە وەرگرتووە، ساڵی ١٣٨١ ك / ١٩٦٣.

* دکتۆرای لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەدەستهێناوە لە زانکۆی بنسلفانیا، ١٣٩١ك / ١٩٧٣ز.

* سکرتێری کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی باڵای پلاندانان و دواتر ئەندامی ئەنجومەنی وانەبێژانی کۆلیژی زانستە کارگێڕییەکان(کۆلیژی بازرگانی جاران)ی زانکۆی شا سعوود (زانکۆی ڕییازی جاران) و سەرۆکی بەشی زانستە سیاسییەکانی بووە، ١٣٨٣ك – ١٤٠٦ك / ١٩٦٤ز–١٩٨٦ز.

* یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەکێتی خوێندکارانی مسوڵمانی ولاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا، و یەکێتی ئیسلامیی ڕێکخراوە خوێنکارییەکان و کۆمەڵەی زانا کۆمەڵناسە مسوڵمانەکانی ولاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا، و نەدوەی جیهانیی لاوانی مسوڵمان لە شانشینی عەرەبستانی سعوودی، و پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە.

* سکرتێری گشتیی دامەزرێنەری سکرتارییەتی گشتی نەدوەی جیهانیی لاوانی مسوڵمان لە ڕییاز، یەکەمین سەرۆکی پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی، بەڕێوەبەری گشتی پێشووی پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی، و سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری قوتابخانەکانی (منارات الرياض) تا ساڵی ١٩٧٤ز، سەرۆکی دامەزرێنەری دامەزراوەی گەشەپێدانی منداڵان و دامەزرێنەر و سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی زانا کۆمەڵناسە مسوڵمانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا.

* بەڕێوەبەر و دامەزرێنەری زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا ١٩٨٨ز- ١٩٩٩ز.

* ژمارەیەك کتێب و باسی زانستیی سەبارەت بە تیۆریزە کردنی ئیسلامییانە ی ریفۆرم و گۆڕانکاریی ناو ئوممەت و تازەکردنەوەی هزری ئیسلامی نووسیوە.

**لە دانراوەکانی ئەوە:**

١- بیردۆزە ئابوورییەکانی ئیسلام: فەلسەفە و میکانیزمی هاوچەرخ، ١٩٦٠ز.

٢- بیردۆزە ئیسلامییەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان: ئاراستەگەلێکی نوێ بۆ هزرو میتۆدۆلۆژیای ئیسلامیی، ١٩٧٣ز.

٣- قەیرانی عەقڵی مسوڵمان، ١٩٨٦ز.

٤- بابەتی لێدانی ئافرەت وەك چارەسەرێك بۆ کێشەکانی ژن و مێرد، ٢٠٠٢ز.

٥- منداڵیی: ڕەهەندی ون لە پرۆژەی ریفۆرمی ئوممەتدا، ٢٠٠٣ز.

## وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا:

## دکتۆر صەباح موحەممەد بەرزنجی



* لـە گونـدی نـەوێ لـە بنـاری شـارەزوور لەدایکبووە، ١٩٦٨ز.

* سـەرەتایی و ناوەنـدی لـە سەیدصـادق و ئامـادەیی لـە کوردسـتانی ئێـران تـەواو کـردووە، ١٩٨٧ز.

* بەکالۆریوسی فیقهـی ئیـسلامیی (١٩٩٣ز) و ماسـتەری فیقهـو یاسـای ئیـسلامیی (١٩٩٦ز) و سەرەنجام دکتۆرای فیقهـو بنـەماکانی یاسـای ئیـسلامیی (٢٠٠١ز) لـە کۆلیـژی ئیلاهییاتی زانکۆی تاران بەدەست هێناوە.

* ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی بە پلەی پرۆفیسۆری یاریـدەدەر و لە کۆلیژەکانی زانستەمرۆڤایەتییەکان، یاسا، یاسای ئێواران و زمان وانەبێژە.

* سەرپەرشتیی چەند نامەی ماستەری کردووە و ئەندامی لیژنەی گفتوگۆی چەندین نامەی تریش بووە.

* چـەند بـاس و لێکۆڵینـەوەو بابـەتی لـە گۆڤـارە جیاجیاکانـدا بـڵاو کردووەتەوە.

* چەند دانراوێکی هەیە بە زمانەکانی عەرەبی و کوردی وفارسی، لەوانە:

١- بابەتە کەلامییەکان لە ئصولی فیقهـی ئیـسلامیدا (نامـەی ماسـتەر- بـە زمانی فارسی) ١٩٩٦ ز.

٢- سێ گۆشه نیگا، ١٩٩٨ز.

٣- أهم الفرق الإسلامية، ١٩٩٨ز.

٤- دینامیزمی فیقهی ئیسلامی له مێـژوودا (نامـهی دکتـۆرا - بـه فارسـی) ٢٠٠١ز.

٥- ظاهرة الإرهاب وضرورة الحد منها، ٢٠٠٤ز.

٦- تاريخ الفقه الإسلامي، ٢٠٠٧ز.

٧- له ئیحرامی ئەدەبدا، ٢٠٠٧ز.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پازدەهەمی کۆچی (١٤٠١ ك – ١٩٨١ ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لە پێناو تەئصیلکردنی مەسەلە هەمەکییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكلّيات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیری و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بە ئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازیی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی، پەیمانگا چەند هۆکارێك دەگرێتە بەر، لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستیی و فیکریی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا و توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و، بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستیی و ئەکادیمییەکان لە پێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفەدا.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبیی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە رێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند رێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستیی هاوبەش هەیە.